# پرشنگی رۆژی کوردەواری لە شەرحی بوخاری

مەلا حسێن شێخ سعدی

بەرگی (١-٢)

# پرشنگی ڕۆژی کوردەواری

# لە شەرحی بوخاری

فوئادی

## دانەر

### مەلا حسین شێخ سعدی

بەرگی یەکەم

نووسینەوە و ئامادەکردنی بۆچاپ /:

### بشیر حسین سعدی

لە ساڵی ١٩٥٢ داندراوە

# پرشـــنگی ڕۆژی کوردەواری

# لەشـــەرحی بوخـــاری

دانـــــەر

**مەلاحسین شێخ سعدی**

**بەرگی یەکـەم**

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆچاپ :

**بشیر حسین سعدی**

لەســـاڵی ١٩٥٢ داندراوە

**لە چاپخانەی ( الجاحظ ) لە بەغدا چاپکراوە ـ ١٩٨٦**

## پێشەکی

ئەوا لێرەدا شاکارێکی تری زانای گەورەی خوالێخۆشبوو مەلا حسین شیخ سعدی ــ تان پێشکەش دەکەین هیوادارین جێی ڕەزامەندی ئێوەی بەڕێز بێ •

لەسەرەتای سالی ١٩٤٩ کەوتە سەرپەری ئەوەی ئەم پەرتووکە دابنێ• کەچۆن مەعنای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی پەهەرسی٣٠ جزئیەوە لەسالی ١٩٣٠ تەواوکرد لەتەفسیری ژیانی ئینسان •

هەر بەم شێوەیە ویستی فەرموودەکانی سەروەری گەورەمان محمد(د) وەربگێڕێتە سەرزمانی کوردی بۆئەوەی لایەکی تری ئایینی ئیسلام کەفەرموودەکانی پێغەمبەری گەورەمان (محمد)ە ڕۆن بکاتەوە •

ئەوەی بەردەستتان بەرگی یەکەمی تەرجەمەی بۆخاری پیرۆزە • ژمارەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر کەلەو پەرتووکەدا وەری گێڕاوەتە سەرزمانی کوردی ژمارەیان [١٤٣٥] هەزارو چوارسەدو سیو پێنج حەدیثە•

ئەم بەرگی یەکەمەیان (٢٠٠) دووسەد حەدیثە بەگوێرەی ئەم دابەش کردنە، ئەم پەرتووکە دەبێتە حەوت بەرگ •

**کۆ کردنەوەی حەدیث**

لەکاتی ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست ( محمد )•دە•ڕێی نەداوە کە فەرموودەکانی بنووسرێتەوە نەوەکوو لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز تێکەڵ بێ•و لەئەنجامی ئەم نووسینەوەدا تووشی گیرو گرفت بین لەلەبەرکردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز •

## نووسینەوەی حەدیث

بەڵام پاش ئەوەی کەقورئان •

نووسرایەوەو تەدوین کرا لەزەمانی ئیمامی عثمانی کوڕی عەفان سەلامی خوای لێ بی ترس لەوەنەما کەفەرموودەکانی پێغەمبەر تێکەڵ بەقورئان بێ• ئەوە لەلایەك •

لەلایەکی تریش پاش ئەوەی کەئاینی ئیسلام بەووڵاتی عیراق‌و ئیران‌و شام‌و مصر بلاوبۆوە • پێویستی‌یەکانی شەریعەتی ئیسلامی زۆر فرموان بوو بۆیە ، بڕیاریان دا کە لەهەموو لایەك فەرموودەکانی پێغەمبەر کۆبکرێنەوە بۆئەوەی ببێتە سەرچاوەی دووەم بۆشەریعەتی ئیسلام لەپاش قورئانی پیرۆز •

لەو مەیدانەدا چەند کەسایێك ناویان دەرکردو ئەوحەدیثانەی ئەوان کۆیان کردەوە بەڕاست ناسران کەپەرتووکەکانیان بەڕاست دەناسران•وەکوو [ صەحیحی بوخاری ]وە [ صەحیحی موسلم ] •

وە بۆ ڕۆن کردنەوەی ژیانی ئەم زانا گەورانەی بوونە بەردی بناغەی زانیاری ( عیلمی حەدیث ) لەئایینی ئیسلام‌و بۆشایی‌یەکی یەکجار گەورەیان لەشەریعەتی ئیسلام پڕکردەوە • بۆیە لەخوارەوە باسی ژیانی هەندیکیان دەکەین •

### ١ ــ بوخاری

ئەم زانا گەورەیە ناوی محمد کوڕی اسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەی جوعفی ــ بوخاری ــ ناوی دەرکردووە •

چونکە موغیرە بابی باپیری ئەم زاتە بووە •

ئاگرپەرست بووە لەسەر دەستی یەمانیبوخاری موسولمان بووە ، کە بە جوعفی ناسرابوو •

ئەو جوعفی‌یە باوکی عەشیرەتەك بووە لەیەمەن • لەرۆژی هەینی لە ١٣ شوال ١٩٤هـ •

لەدایك بووە وە لە شەوی جەژنی رەمەزان مردووە لەسالی ٢٥٦هـ •

تەمەنی شەستو دوو سال ـ سێزدە ـ رۆژ کەمبووە • چە کوڕی لەپاشی بەجێ نەماوە •

لەپێناوی زانینو حەدیث کۆکردنەوە وە حـەدیثی زۆری وەرگرتووە لەخوالیخۆشبوان

١ ـ مەکر کوڕی ابراهیم البلخی و ٢ ـ ابی نعیم الفضل ٣ ـ احمـد حنبل ٤ ـ یحیا ابن معین •

وە خەلکەکی زۆریش فەرموودەکانی پێغەمبەریان ، لە محمدی بوخاری وەرگرتووە •

ئەم زانا گەورەیە بۆ کۆ کردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر نـەوەد هەزار کەسی دیتووەو حەدیثی لێ وەرگرتوونە •

هەر بۆ ئەم مەبەستەـمحمدی بوخاری ـرەحمەتی خوای لێبی دەلێ:
ئەم پەرتووکەی ( صحیحی بوخاری ) لەناو ـ شەش سەد هـەزار حـەدیث دەرم هێناوە • وە هەرحەدیثەکەم نووسیبیتەوە دوورکعەت نوێژم کردووە سوپاسی خوام کردووە کەسەرکەوتم بۆ ئەوکارە گەورەیە •
بۆیە پەرتووکەکەی ئەویش ناسراوە بە بوخاری ـ یـان صـەحیحی بوخاری ـ •

## ٢ ـ مسلم

دووەم کەس ئەوانەی کە فەرموودەی پێغەمبەریان کۆکردیتەوەو پەرتووکەکەی بەڕاست ناوی دەرکردووە ـ(صەحیحی موسلیمە)ە ناوی ئەم پیاوە گەورەیە:ابو الحسین مسلم ابن الحجاج ابن مسلم القشیری النیسابوریە لە سالی (٢٠٤) کۆچی لەدایك بووە وە لەسالی (٢٦١) کۆچی لەمانگی ڕەجەب مردووە . لەتەمەنی پەنجاو حەوت سالی .

لەپێناوی زانیاری حەدیث کۆکردنەوە زۆر جێ گەڕاوە . وە زۆر فەرموودەکانی پێغەمبەری لەم بەڕێزانە وەرگرتووە .

١ ـ یحیا ابن یحیا ٢ ـ قتیبە ابن سعید ٣ ـ اسچاق ابن راهویە ٤ ـ احمد ابن حنبل

وە زۆرانی دیکەش .

وە دەفەرمووی پەرتووکی [ المسند ]م لە سێ‌سەد هەزار حەدیث پێك‌هێناوە کەلەم سێ‌سەد هەزار حەدیثە ئەوە ئەمە زۆر بەڕاست زانی‌و نووسیمەوە .

و ( خطیب )ی بەغدادی دەفەرمووێ ئیمامی مسلم ـ لەدوو بوخاری ڕۆیشتووە لەشێوەی حەدیث کۆکردنەوە و هەر لە دوو ئەو چووە .

## ٣ ـ ابو داود

ناوی سلیمان ابن الاشعث ابن اسحاق الاسدی سەجستانی ـ بووە .

لەپێناوی زانین‌و حەدیث کۆ کردنەوە زۆر گەڕاوە . زۆرشتی لەسەر خەلکی عیراق‌و شام‌و مصرو خوراسان نووسیوە لەسالی (٢٠٢) کۆچی

لەدایك بووە وە لە ٢٠ شوال سالی ٢٧٥ کۆچی •

کۆچی دوایی کردووە •

وە حەدیثی وەرگرتووە لەمەشایخی گەورە وەکوو بوخاری و مسلم و احمد ابن حەنبەل •

وە (عثمان ابن ابی شیبه) • وە قوتەیبە ابن سعید •

وە زۆر کەسیش حەدیثی لەئەو وەرگرتووە وەکوو ١ ـ ابو عبدالرحمن النسائی و ٢ ـ ئەبوو علی اللؤلؤی • وە زۆرانی دیکەش •

پەرتووکی ( السنن )ی داناوە پیشانی امامی احمد ابن حەنبەلی داوە ئەویش زۆری ڕالی بووەو پەسندی کردووە • ( ابو داود ) ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ دەفەرمویّ (٥٠٠،٠٠٠) پێنج سەدهەزار حەدیثی پێغەمبەرم کۆکردەوە تەنیا [ ٤٨٠٠ ] چوار هەزارو هەشت سەد حەدیثی لەپەرتووکەکەی خۆی دا نووسیوە •

وە دەفەرموی بۆ پاراستنی ئاینی هەر موسولمانێك ئەم چوار حەدیثە بەسە •

١ ـ الاعمال بالنیات •

٢ ـ من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه •

٣ ـ لا یکون المؤمن مؤمنا حتی یرضی لاخیه ما یرضی لنفسه •

٤ ـ الحلال بین والحرام بین •

ئەبوو داود لە پلە هەرە بەرزەکانی زانین بووە ( خطابی ) گووتوویە ـ لەزانینی ئاینی ئیسلامی پەرتووك دانەنراوە وەکوو پەرتووکی [ السنن ] لابی داود •

ئەبوو داوود فەرموویەتی ــ لەم پەرتووکەی خۆما هیچ حەدیشـــەکم نەنووسیتەوە ئەگەر خەلکی بڕیاری ناڕاستیان بەسەر دابێ •

٤ ــ الترمذي

ناوی ( ابو عیسی محمد ابن عیسی ) ناسراو بە ــ ( الترمذی ) لەسالی (٢٠٠)ك • لەشەوی دووشەم ١٣ رجب، سالی ٢٧٩ کۆچی

لەدایكبووە • یەکێك لەزاناکانی کە فەرموودەی پێغەمبەری لەبـەر بووە • یەکێك بووە وەکوو [ قوتەیبە ابن سعید ] •

وە [ محمد ابن بشار ] • وابن الحجر العسـقلانی • وە خەلکـەکی زۆریش حەدیثی لەئەو وەر گرتووە •

پەرتووکەکی داناوە لەحەدیث بەناوی [ الصحیح ]• دەفەرموێ ئـەم پەرتووکەم پیشانی زاناکانی وولاتی حیجازو خوراسان داوە پەسـندیان کردووە وە گوتراوە هەرچی ئەم پەرتووکەی لەمـالی دابێ هـەروەکوو پێغەمبەری گەورەمان محمد ــ لەمالیابێ ئەوهابیە •

٥ ــ النسائي :

ناوی ابو عبدالله احمد ابن شوعەیب ابن علی ابن بەحر ــ لەسالی ٢١٥ کۆچی لەدایك بووە •

وەلەشاری مەکە کۆچی دوایی کرد لەسالی (٣٠٣) کۆچی •

یەکێکە لەزاناکانی حەدیث • وە زۆر حەدیثی لەقوتەیبە کوڕی سعید وەرگرتووە •

وە لەعلی کوڕی حشرم واسحاقی کوڕی ابراهیم وە لەمحمد ابن بشار وە ئەبی داود السجستانی • وەلەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعی بووە • وە علی کوڕیعمر الحافظ لەسەر نسائی ـ بەمشێوەیە دەدوێ ـ ابو عبدالرحمن النسائی ـ لەپێش هەموو ئەوکەسانەیە کەلەزەمانی خۆی ژیاوە وە زۆر لەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەریان لەبەربووە وە ئەویان پەسند کردووە وەکوو عبدالله ابن احمد وە احمد ابن حنبل •

وە خاوەنی پەرتووکی [ المجتبی ] پە لەحەدیث •

هیچ حەدیثی تێدانییە کەبە تەواوی ڕاست نەبێ •

٦ ـ ( ابن ماجـة )

ناوی ابو عبدالله محمد کوڕی یزید کوڕی ( ماجه )ی قـەزوینییە • لەسالی (٢٠٧) کۆچی لەدایك بووە • یەکێك بووە لەزانـا گـەورەکانی حەدیث •

وە یەکێك بووە لەشەش امامەکانی حـەدیث • یەکـەم کەس کـە (ابن ماجه)ی خستە سەر پێنج ئیمامەکەی دیکە ابو الفضل کوڕی طاهر بووە•

وە لەسالی (٢٧٥ك) کۆچی دوایی کردووە لە ڕۆژی سێشەمە •

ئەم شەش پەرتووکەی باسمان کرد لەگەل دانەرەکانیان ناسراوون بە ( کتب السنه ) •

وە ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر کە لەم پەرتووکەدایە لەم شەش کتیبـە ڕاستەی باسکراودا هەیە هیچ گومـان لەڕاسـتییان نییەو هیوادارین

بۆخوێندەواری خۆشەویستی کورد مایەی سوود لێوەرگرتن بێ بۆ کاروباری دین و دونیا .

بشیر حسین سعدي
( بلاوکەرەوە )

---

بۆ نووسینی ئەم پێشەکییە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرت .

١ ــ كتاب تيسير الوصول الى جامع الاصول / من حديث الرسول للعلامة عبدالرحمن ابن علي المعروف بالشيباني . جـ١ .

٢ ــ سجل السلام فى بلاغ المرام في جمع ادلة الاحكام للعلامة محمد ابن اسماعيل الصنعاني .

## مێــژووی ژیــانی دانــەر

دانەری ئەم پەرتووکە پیرۆزە وەرگێری فەرموودەکانی پێغەمبــەری گەورەمان محمد دروودی خوای لەسەربێ ـ لەپەرتووکی بوخاری •
زانای گەورەو خوالێ خۆشبوو ـ مەلاحسین شیخ سعدی ـیە •
لەسالی ۱۸۸۳ زاینی لەشاری هەولێر لەگــەرەکی خەنــەقا هــاتوەتە دونیاوە • وە بەرەچەلەك لە عەشیرەتی بلباسە وەلەلای زۆر زانای گەورەی زەمانی خۆی خوێندوویەتی وەکوو مەلاعبداللهی چەلی زادە لەکۆیەو لەگوندی سکتان لای مەلا احمدی خەلیفە ـ ولەهەولێر لای مەلا ابو بکر عمر افندی وە هەرلای ئەمزاتەش اجــازەی مەلایەتی وەرگرتووە • لەســـــالی ۱۹۱۳ لەگوندی قەیلان دامەزراوە بەمەلا ـ وەلەزۆر گونــدی تریش مەلایــەتی کردووە وەکوو سیاو خورمەلەو ماستاوەو سورێژەو دووگردکان لەدەشتی هەولێر • وەلەسالی ۱۹٤۷ لەدووگردکان هاتە هەولێر : وە بووە ئیمـــــامی مزگەوت •

وەلەسالی ۱۹۷۱ خانەنشین کرا • هەربە خوێندنەوەی پەرتووکی ئاینیو قورئــــان خوێنــــدن خەریكبووە تالەبەیــانی رۆژی یەکشــەم لـــە ۱۱ـ۱۲ـ۱۹۸۳ لەسەعات دەی بەیانی کۆچی دوایی کرد •
وە لەگۆڕستانی ـ چراغ ـ لەهەولێر نێژراوە •

**دانراوەکانی**

۱ ـ ژیانی ئینسان تەفسیری قورئان دەکەوێتە شەش بەرگ هەتائێســـتا سێ بەرگی لێچاپی کراوەو بەرگی چوارەمی لەژێر چاپدایە •

٢ ــ پرشنگی ڕۆژی کوردەواری لە فەرموودەکانی پێغەمبەر لەپەرتووکی بوخاری ــ کەوەرگێڕانی ١٤٣٥ فەرموودەی پێغەمبەرە بۆسەرزمانی کوردی ئەویش دەکەوێتە حەوت بەرگ •

٣ ــ جامع الصغیر ــ دەکەوێتــە سێ بەرگ ئەویش وەرگێڕانی فەرموودەی پێغەمبەرە بۆسەرزمانی کوردی •

٤ ــ دیوانی هەلبەستی کوردیو عەرەبیو تورکیو فارسی • بــەڵام بەشی زۆری بزربووە • ئەویش ئێستا لەژێر چاپدایە •

٥ ــ وەرگێڕانی قەسیدەی بوردیە لەعەرەبیەوە بۆکوردی بەهەمــــان کێشو قافیە •

٦ ــ شەرحی چوارینەکانی خەیام بەعەرەبی بەناوی [ حقائق الخیام ] •

٧ ــ وەرگێڕانی قەسیدەی توحیــــدیەی فریدالدین عەطار لەفارسیەوە بۆعەرەبی •

٨ ــ وەرگێڕانی لەمەعات فخرالدین عراقی ــ لەفارسیەوە بۆعەرەبی •

٩ ــ شەرحی ذات الشفا بەکوردیی •

١٠ــ پەرتووکی [ العقود ] بەعەرەبی • کەبریتیە ٥٨٧ بەیت هەلبەستیعەرەبی • لەفقهی شافعی •

١١ــ نەظمی تهذیب المنطق بەعەرەبی •

١٢ــ شەرحی لەوائح لەفارسی بۆعەرەبی •

١٣ــ پەرتووکی بەلاغەت بەعەرەبی •

١٤ــ منهج الحقیقە بەعەرەبی •

بشیر حسین سعدي
بلاوکەرەوە

لا اله الا الله محمد رسول الله

بسم الله الرحمن الرحيم

## تەرجەمەی بوخاری شەریف بەکوردی

### باب

### كيف كان بدء الوحي الى رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم
### باسی چونیەتی هاتنی وەحی بۆپێغەمبەر ( درووودی خوای لەسەربێ )

**١ ــ عن عمر ابن الخطاب (ض) انما الاعمال بالنيات وانما لكل امرء ما نوى • فمن كانت هجرته الى دنيا يصيبها او امرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه •**

( تەرجەمە )

١ ــ ڕیوایەت کراوە لەحەزرەتی عمر کوڕی خطاب ڕەزای خودای لێبێ کوڕی ( نوفەیل ) لەساڵی بیستو سێی کۆچی لە مەرتەبەی شەهادەت وەفاتی‌کرد • لەسەر مینبەر خوطبەی دەخوێندەوە گوتی بیستم لەپێغەمبەری خودا • دەی فەرموو نیە هیچ‌کردارو گوفتاری بەدەنیە • کەم یازۆر لەفەرزو سونەت صادربین لەهەر ئیمانداریکی موکەلەف وە بەتەحقیق وەبێ‌گومان نیە بۆمیچ پیاوێك ( یەعنی بۆهیچ موکەلەفێك لەژنو پیاو ) جەزای ئەوشتە نەبێ کەبەدل قەصدی کردووە•لەکرداری خۆی وەگوفتاری خۆی کەوایە هەر کەسێك سەفەربکا بۆخاتری دونیا کەبۆی ببێ یابۆخاتری ژنێك کەمارەی بکا ئەوسەفەرەکەی بۆ ئەوشتەیە کەقەصدی کردووە کەدونیایە یاخۆژنە •

٢ ــ سەرەتای وەحی

## عن عائشة (ض) أحيــانا يأتيني مثل صلصلة الجرس وهو اشده علي فينفصم عني وقد وعيت عنه ما قال واحيانا يتمثل لي الملك رجلا فيكلمني فأعي ما يقول •

( تەرجــەمە )

٢ ــ ریوایەت کراوە لەدایکی ئیمانداران خێزانی پێغەمبەر ( صلی الله تعالی علیه وسلم ) حەزرەتی عائشە ڕەزای خودایـــان لێبێ لەســـالی پەنجاوپێنجی هجری وەفاتیکرد نۆسالّ لەخزمـــەت پێغەمبـــەربوو • کچی ابو بکر الصدیق بوو • کە پێغەمبەر • وەفاتیکرد ئەو تەمـــەنی هـــەژدە سالّبوو • ئنجا گوتی حەرثی کوڕی هیشام برای لەدایكو بابی ئەبوجەهل ( کە بە ابو الحکم ناسرابوو پێش هاتنی ئیسلامەتی ) • کە ئەو حـــەرثی هیشامە یەكێك بوو لەگەورە گەورەکانی ئەصحاب لەڕۆژی فەتحی مەکـــە موسولمان بوو لەتاریخی پانزدەی هیجری لەفتوحاتی شـــامبوو • عەرضی پێغەمبەری کرد یا رسول الله چاۆن وەحیت بۆدێ فەرمووی لەمەندێ کات• وەحیم بۆدێ بەدەنگێکی کەلەدەنگی زەنگولە ئەچێ ئەمە لەهەموو جۆرەکانی وەحی سەخـتـرە چونکی تێگەیشتن لەقسەیەك وەکوو دەنگی زەنگولەبێ دیارە تێگەیشتنی لەهەمووشتێ زەحمەت ترە •

پاشان ئەم شیدەتو سەختیەم لەسەر لادەچی کـــەچی وەحیەکەشـــم مەحفوظەو ضەبطم کردووە ــ واتە لەبەرم کـــردوە هـــەرچی کەجوبرەئیل گوتوویەتی • وە هەندێ کاتیش جوبرەئیل خۆی دەخاتە سەرشکلی پیاوێك

لەسەر شێوەی پیاوێکی وەکوو ( دەحیە ) یاغەیری ئەو قسەم لەگەڵ دەکا لەگفتوگۆیەکەی ئەو وەحیەکە ضەبط دەکەم • لەبەینی ضەبطی وەحی لەم لەم دوو صورەتە فەرقێك هەیە • لەصورەتی پێشوو لەپێش لاچوونی ــ مەلەك ــ لەبەری دەکرد نەشی دەزانی چۆنی لەبەر کردووە • بۆیێ بە صیغەی کاری ڕابردوو ئەدای فەرمووە ئەڵێ [ وعیت ] لەصورەتی دووەم لەکاتی قسەکردن لەبەری دەکرد بۆیە صیغەی کاری ڕانەبردوو ئەدای فەرمووەگوتی [ فیکلمنی فأعی ما یقول ] دەبزانی چۆنی لەبەر دەکا •

حەزرەتی عائشە ڕەزای خوای لێبێ فەرمووی والله پێغەمبەرم دیت لەکاتی هاتنە خوارەوەی وەحی لەڕۆژی زۆرسارد پاشان سەختی وەحی لەسەر لادەچوو ناوچەوانی پیرۆزیشی ئارەقەی لێهەڵدەڕژا •

ریوایەت کراوە لەعائشە بەبیستن لە پێغەمبەر صلی الله تعالی علیەوسلم وەحی لەئەوەلەوە خەونی باش بوو لەحالی نووستن بۆی دەهات هەر خەوێکی بیدیتایە وەکوو ڕۆناکی بەیانی ئاشکراو دیارو نەشاراوە بوو •

وەکوو خەونی چوونە ناو مسجد الحرام مثلا ــ یەعنی هەرچی لەخەو دەی دیت ڕاستو ڕاست جێبەجێ دەبوو • پاشان تەنهایی لاشیرین کرا دەچوو غاری کێوی ( حیرا ) بۆ تەحەنوب لەعالەم واتە دوورکەوتنەوە لەخەلکی ــ تەحەنوثی وە ئیعتزالی دەکرد • ( تەحەنوث ) واتە دانیشتنی چەند شەوو ڕۆژێکی ژمراوە بۆ خوا پەرستی کەئێستا بەشەرع پێی دەگوترێ ئیعتکاف ) • خواپەرستیەکەشی هەر بیرکردنەوەبوو • لەپێش هەوەسو گەڕانەوەی بۆمالی خۆی • وە خەدیجە بۆئەم خەلوەیە زادی دەبرد • پاشان دەگەڕاوە لای خەدیجە دووبارە زادی دەبرد • ئیتر هەر بەم تەرزە هەتا ئەمری حەقی ــ خوداوەندی عالەمی بۆهات کەوەحیە لەغاری

( حیرا ) ئنجا جوبرەئیل هاتەلای لەرۆژی دووشەم لە١٧ رمضان/حەڤدەی ڕەمەزان • لەتەمەنی چلساڵیدا • ئنجا جوبرەئیل پێی گوت بخوێنە پێغەمبەر فەرمووی من خوێندەوار نیم•فەرمووی جوبرەئیل منی گرتو ڕای گوشیم وەبەخۆیەوە نووساندم • هەتا مونتەهای تەحەمولو تاقەتم پاشان بەڕەللای کردم • پاشان دووبارە پێی گوتم بخوێنە منیش گوتم من خوێندەوارنیم ئەمجارەش منی گرتو بەخۆیەوە رای گوشیم لەپاشان بەڕەللای کردم • ئنجاگوتی ( اقرأ باسم ربك الذی خلق خلق الانسان من علق اقرأ وربك الاكرم الذی علم بالقلم ) • ئنجا پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم بەم ئایەتانەوە گەڕاوە ماڵی بۆلای خەدیجە دلی مبارەکیشی دەلەرزی لەبەر دیتنی ئەم کارە سەر سوڕهێنەرە • کەموخالفی عادەتو بەدەهشەتبوو فەرمووی دام پۆشن دام پۆشن•چونکی عادەتە بەداپۆشین لەرز دادەمرکێو سکونەت دەکا •

ئنجا دایان پۆشی هەتا هاتەوە سەرخۆی ئنجا هەرچی دیتبووی • بۆ خەدیجەی گێڕاوە • فەرمووی بەڕاستی لەخۆم ترسام کەبمرم یابەناساغیەکی زۆر گران بکەوم ئنجا خەدیجە گوتی ( لا ) • والله خودا تۆ ڕەزیلو غەمناك ناکا بەقەطعی • چونکی تۆ پارێزگاری صلەی ڕەحمو خزمایەتی دەکەی •وە تەحەمولی بارگرانی بێدەسەلاتان دەکەیو شتیوا بەخەلکی دەدەی لەلای غەیری خۆت پەیدا نابێ • وە خواردن بەمێوان دەدەیو یاریدە دەری لەسەر ڕووداوەکانی کەحەق بن • نەك لەسەر حەوادثاتی ناحەق • بیربکەنەوە لەزیرەکی خەدیجە وە لەکەماڵی عەقلی خەدیجە چلۆن استدلالی کرد لەسەر سوێندی خۆی بەو کارانەی کە ڕەووشتی باشی لێکۆدەبێتەوە • ئەمە دەلیلە هەر کەسێك ڕەوشتی لەسەر کاری باش بێ زیانی پێناگا • ئنجا خەدیجە

پێغەمبەری بردە لای ئامۆزای خۆی • وەرەقەی نەوفیل کوڕی ئەسـەدی کوڕی عبدالعزی • وەرەقەش پیاوێك‌بوو لەبەر ئەمە کەزانای وەقت بوو تێ دەگەیشت کەپەرستنی بوت‌و سەنەم ـ شـتێکی پووچەلە • بوو بوو بەدیان هەر خەریکی نووسینی کتابی عیبرانی بوو ئنجیلیشی دەنووسی‌یەوە ئەوەندی خودا حەزبکا • اختیارێکی گەورە ماقوول‌بوو • چاویشی کوێر بوو بوو خەدیجە ڕووی لەوەرەقە کرد • گوتی ئەی‌ئامۆزا گوێ بدە برازای خۆت •

وەرەقە گوتی ئەی برازای خۆم چی‌دەبینی پێغەمبەریش صلی الله تعالی علیە وسلم هەرچی دیبووی بۆی گێڕاوە ـ وەرەقە گوتی ئەمەی تۆدیوتـە ئەمە ناموسی ئەکبەرە یەعنی صاحبی سری وەحی‌یە • کەجوبرائیلە بۆلای پێغەمبەران دێ • چەندجار هەتاردیتی‌یە خوارێ خودا بۆلای موسی • ئەی خۆزیا لەماوەی پێغەمبەرایەتیت من لەسەر جاحیلی‌و قوەت بوومایە • ئەی خۆزیا بژیامایە هەتا قەومی خۆت دەرت دەکەن • پێغەمبەر فەرمووی چمـا دەریشم دەکەن • وەرەقە گوتی بەڵێ هیچ پیـــاوێك نەهـاتووە ، بەمثلی ئەوشتەی کە تۆ پێ‌هاتووی الامەگەر دوژمنایەتی هەرکراوە • وەئەگــەر ڕۆژی بلاوبوونەوەی پێغەمبەرایەتی تۆ بگاتەمن • یاریدەت دەدەم بە یاریدە داتێکی زۆر بەهێز • لەپاشان زۆری پێ‌نەچوو وەرەقە وەفاتی کرد•سستیش لە هاتنە خوارەوەی وەحی پەیدابوو بۆماوەی سێ‌ساڵ هـــەر وەکوو لە تەئریخی ئەحمەد وادەڵێ‌و • ئەبواسحاقیش بەتەواوی وا دەڵێ • لای هەندە محدثانیش دوو ساڵ‌ونیو هەتا بەغایەتێکی وا پێغەمبەر صلی الله تعالی علیە وسلم غەمناك بووفکری دەکرد خۆی‌لەسەر کێوان فڕە بداتە خوارێ •

ڕیوایەت کراوە لەجابری کوڕی عبدالله عەمری ئەنصاری خەزرەجی

کەلەپاش کوێربوونی لەسالی حەفتاو هەشت لەپاش هەموو ئەصحاب لەمەدینە وەفاتی کرد حەدیثی ڕاوەستانی وەحی دەخوێندەوە بۆخەلکی پێغەمبەر فەرمووی وەقتێك دەڕۆیشتم لەناکاو گوێم لەدەنگێك بوو لەئاسمان سەرم بلندکرد دیتم ئەو مەلائکەی کەلەغاری [ حیرا ] هاتە لام دانیشتووە لەسەر کورسی‌یەك لەبەینی ئاسمان‌و عارد لێی‌ترسام‌و گەڕامەوە مالی خۆمان بۆلای خەدیجە پێم گۆتن دامپۆشن دامپۆشن • خودای عەزەوەجەلە بۆی ناردمە خوارێ • [ یا ایها المدثر قم فانذر وربك فكبر وثیابك فطهر والرجز فاهجر]• ئنجا لەپاش هاتنە خوارەوەی ئەم چەند ئایەتە هاتنە خوارەوەی وەحی لەدوویەکتری بەگەرمی دەستی پێ‌کرد •

**دەربارەی عبداللە کوڕی عەباس**

ڕیوایەت کراوە لە حیبری ئومەت‌و تەرجەمانی قورئـــان وە یەکێك لەچوار عباد کەلەپاش کوێربوون لەسالی شەصت‌و هەشتی کۆچی لە طایف وەفاتی کرد عبداللە کوڕی عەباس ڕەزای خودایان لێ‌بێ • لەتەمەنی حەفتاو یەك سالیدا لەزەمانی عبداللە کوڕی زوبێر • لەبوخاری دووسەدو حەڤدە حەدیثی هەیە •

عبداللەی کوڕی عباس ڕەزای خودایان لێ‌بی لەم ئایەتە لا تحرك بـە لتعجل بە قسەی دەکردو حەدیثی دەخوێندەوە • پێغەمبەری خودا گوتی وەکوو وەحی بۆ دەهاتە خوارێ خەریك دەبوو چارەو موعالەجەی سەختی‌و شیدەتی وەحی بکا • لێوەکانی پیرۆزی خۆی دەجوولاند بۆ خاتری ئەوەی زوو لەبەری بکا •

ڕاوی گوتی کوڕی عباسیش گوتی منیش لێوی خۆم دەجوولاندەوە وەکوو پێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وسلم ئنجا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ ( لا تحرك به لساتك لتعجل به ان علینا جمعـــــه وقرآنــه ) یعنی یا محمد نالووکە مەکە لەوەقتی وەحی ئەمە عائد بەئێمـــــەیە بیگیرین بەقورئانەو لەناوسینەی تۆکۆی بکەینەوە • ئنجا لەمەپاش پێغەمبەر صلی الله تعالی علیە وسلم وەکوو جبرەئیل بهاتایە لای تەنیا تەنیا هەر گوێی دەدایە وەکوو بڕویشتایە دەی خوێندەوە وەکوو خوێندنی جوبرائیل •

لە ــ ابن عباس ــ ریوایەت کراوە کەپێغەمبەر بەمطلقی لەهەمووکەس سەخی تروبەخشندەتربوو•خصوصا لەمانگی ڕەمەزان کەزۆر ملاقاتی لەگەل جوبرەئیل دەبوو چونکی چەندملاقاتی زیاتر ببوایە مەعاریفی ڕەبانیەی زیاتر دەکەوتە تەرەقیات وەتەنوزهی لەماسوی زیاتر دەبوو• هەمووشـــەوێکیش لەڕەمەزان دەهاتە لای قورئانی لەگەل دەخوێند • هەتاقەت انفکاکی قورئانی لەناو دلی نەبێ لەسەر وەعدەی خودا چونکی فەرمووی (سنقرءك فلاتنسی)• بەبێ گومان وەبەبێ شوبهە پێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وسلم بۆنەفع بـــە عالەم گەیاندن سەزیمتربو لەبارەی توندی هیچ پەردەی لەڕێش نەبێ •

## گفتو گۆی هیرەقل‌و ئەبوسوفیان دەرحەق
## بەپێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وسلم

### باسی ئەبوسوفیان

ڕیوایەت کراوە لە عبدالله ابن عباس ڕەزای خودایان لێ‌بی گوتی ئەبو سوفیان ــ ناوی صەخربوو • کونیەی ابو حنظلەبوو کوڕی حەربی کوڕی ئومیەبوو • دەساڵ لەپێش سالی فیل لەدایك‌بوو • لەشەوی فەتحی مەکـە مسلمان بوو لەغەزای طائف‌و حونەین حازربوو چاوێکی لەغەزای پێشوو چاوەکەی تریشی لەغەزای یەرموك بەتیر کەم‌بینا بووبوو • لەسالی ( ٣١ ) سی‌ویەکی هیجری لەتەمەنی هەشتاوهەشت سالی لەمەدینە وەفاتی کرد • ئیمامی عثمان نوێژی لەسەرکرد ڕەزای خودایان لێ‌بی ) •

عبداللەی ابن عباس دەگێڕێتەوە دەڵێ ئەبو سفیان خەبەری پێـدام • بەکاروانەکی پێك‌هاتبوو لەسی٣٠پیاو لەئەهلی مەکە بەتجارەت بۆشـــام چووین لەماوەی صلحی حدیبیةلەگەل ابو سفیان‌وکوفاری قورەیش هیرەقل خەبەری کاروانی مەکـەی پێ‌گەیشتبوو • لـــەدوای ناردین بـەخۆیو بەجەماعەتی خۆی لەئەیلیابوون واتە ( شـــاری قودس ) • داوای کردین گەورەکانی ڕۆمیش لەدەورەبوون • گوتی تەرجەمانێك ــ بانگ‌کەن •

تەرجەمان گوتی ئێوە کامەتان بەخزمایەتی لەپێغەمبـــەر نزیکتـرن لەوپیاوەی کەداوای پێغەمبەرایەتی دەکا • ئەبوسوفیان لەوەلامـدا گوتی من‌لەوان خزمترم لەوانە • هیرەقل گوتی : لەمنی بەنزیك بخەنەوە •

ڕەفیقەکانیشی لەلای پشتەوە لەنزیکی ئەو ڕایان گرن•پاشان بەتەرجەمانی

گوت • بەڕەفیقەکانی خزمی پێغەمبەر بڵێ • من دەرحەق بەپێغەمبەرەکەیان هەندێ سؤال لەم خزمەی دەپرسم ئەگەر قسەیەکی درۆی بۆمن گوت ئێوە بەدرۆی بخەنەوە •

ئەبو سفیان گوتی واللە ئەگەر لەشەرمان نەبایە نەوەك ڕەفیقـــەکانم درۆیەکانم بگێڕنەوە ـــ بەدرۆ وەلامم دەدایەوە •

پاشان یەکەم پرسیار ئەوەبوو

س١ : ئەم پیاوە لەناوئیوە نەسەبەی چۆنە • گوتم لەناو ئێمە صاحێب نەسەبەیە •

س٢ : گوتی لەپێش ئەمپیاوە قەت یەکێك لەئێوە ئەم داوایەی کردووە گوتم : نـــەء

س٣ : گوتی لەباوکو باپیری ئەم پیاوە قەت پاشایەك هەبووە • گوتم: نـــەء •

س٤ : گوتی ئەشرافی ناسان واتا ناودارەکان لەگەلیدانەیاخۆزەعیفەکان• گوتم زەعیفەکان •

س٥ : گوتی تابعەکانی لەزیادین یاخۆ لەکەمین گوتم نەء لەزیادین •

س٦ : گوتیئەدی کەس لەتابعەکانی • نەگەڕایتەوە لەبـــەر نارەزایی بەدینەکەی لەپاش چوونە ناو ئەم ئایینە • گوتمنا •

س٧ : گوتی ئەدی لەپێش ئەم ادعایەی لەناو ئێوە قەت موتەهەم نەبووە بەدرۆزن • گوتم : نا

س٨ : گوتی ئەدی غەدر دەکا • گوتمنەء :

گوتمئێمەش لەئەم مودەیە کەلەصلحی حودەیبەو لەسەفەر داینە ئاگامان لێبڕاوە کەچی کردووە • ئایا غەدری کردووە یانەکردووە نازانین • هـــەر [illegible] قسەیەکی خراپی دەرحەق بکەم ئەمەندەنەبێ •

س٩ : گوتی ئێوه کوشتاری لەگەل دەکەن ؟

گوتم بەلێ :

س١٠ : گوتی کوشتارتان چۆنە لەگەل‌ئەو : گوتم شەڕ بەتۆبەتە هەندێ جار ئەوسەر دەکەوێ هەندێ‌جار ئێمە سەردەکەوین .

س١١ : چیتان ئەمر پێ دەکا : گوتم دەلێ عبـادەتی خودابکەن کەیەکە هیچ شریکی بۆ پەیدا مەکەن . ئەوشتەی کەباوکو باپیرتان دەیان پەرسـت مەیان پەرستن وە ئەمرمـان پێ‌دەکا بەنوێـژو بەڕاسـت گۆتن وەبـە دوورکەوتنەوە لەحەرام وەلەناپیاوەتی وە ئەمرمـان پێ‌دەکا بەمحافظـەی حقوقی خزمایەتی ئنجا هیرەقل بەتەرجەمانی گوت .

پێی بلێ من لەنەسەبی ئەووم . ئەوەم لەتۆ پرسی گۆتت لەناو ئێمـە ببەنەسەبە . پێغەمبەر هەموو یان خودا لەئەشرەفی نەسەبی خۆیان هەلیـان دەبژێری .

لەتۆم پرسی قەت یەکێك لەئێوە لەپێش ئەوپیاوە ئەم داوایەی کردووە گوتت نەء چونکی گوتم ئەگەر یەکێك لەخۆیان لەپێش‌ئەو پیـاوە ئـەو داوایەی کردبێ ئەوەش ممکنە لاسای ئەو بکاتەوە .

لە تۆم‌پرسی لەباوکانی ئەوە قەت پاشایەك هەبووە گوتت‌نا . چونکی گوتم ئەگەر لەپێش خۆیان پاشایەکیان هەبووبێ ممکنە ادعای پاشایەتی باوکی خۆی دەکا . لەتۆم پرسی ئەوپیاوە لەپێش‌ئەم قسەی کەدەیکا قەت لەناو ئێوە متهم بووە بەدرۆزن . گوتت‌نا . بەوە دەزانم نابی لەپێش هاتنی بەپێغەمبەرایەتی درۆ نەکا لەگەل خەلکی وەلەپاش ئەوەی بووە پێغـەمبەر دەست بەدرۆیان بکا دەرحەق بەخودا .

لەتۆم پرسی ئەشرافی ناس / ناودارانی خەلکی بەگەلی دەکەوون یاخۆزەعیفەکان گوتت زەعیفەکان ئەتباعی پێغەمبەرانیش زەعیفەکانن .

لەتۆم پرسی تابعەکانی لەزیادینە یاخۆلەکەمینە گوتت لەزیادینە . بەڵێ مادەی ئیمان ئەحوالی وایە هەتا تەواو دەبێ . لەتۆم پرسی هیچ کەسێك لە تابعەکانی واتە ئەوانەی بەگەلی دەکەوون پەشیمان دەبنەوە لەپاش موسولمان بوون . گوتت نەء ئیمانیش وایە کەیف خۆشییەکەی تێکەلی ناودلان دەبێ . لەتۆم پرسی ئەرێ غەدر دەکا . گوتت نا پێغەمبەریش هەموویان وان غەدر ناکەن .

لەتۆم پرسی بەچی ئەمرتان پێدەکا . گوتت ئەمرمان پێدەکا خودا بپەرستن بەتەنیا هیچ شرێکی بۆپەیدا مەکەن وە ئەمرمان پێدەکا بەنوێژ وە بە قسەی ڕاست وە دوورکەوتنەوە لەحەرامو لەناپیاوەتی ئنجا ئەگەر ئەوقسەی تۆدەکەی ڕاست‌بێ .

ئەم عاردەی کەئەم دووقاچەی من لەسەرە بەملك دەیگری وە بەحەقیقەت هەتا ئێستا واتێگەیشتم ئەم‌پیاوە خارجە لەئێوە نەم دەزانی لەقوڕەیشە ئەگەر بمزانیبوایە من بەدلێکی ساغ بە خدمەتی دەگەیشتم ئەو ئەزیەتەم دەکێشا لەسەر ئەو ئازارەی کە ئەو تێدایە . وە ئەگەر لەخدمەتی ئەو بوومایە قاچی مبارەکی ئەووم دەشووشت پاشان بانگی‌کرد کاغەزی پێغەمبەرم بۆبینن . کەبە دەحیەی دا ڕەوانە کرابوو بۆگەورەی خەلکی ( بوصری ) ئەویش دای بەهیرقل .

## بســـم الله الرحمن الرحيم

### نووسراوی پێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وســـلم
### بۆ هیـــرەقل
### بەهۆی سەرکردەی شـــاری ( بوصری )

أ عن ابن عباس بسم الله الرحمن الرحيم من محمد ابن عبدالله ورسوله الى هرقل عظيم الروم ۰ سلام على من اتبع الهدى ۰ أما بعد فاني أدعوك بدعاية الاسلام ۰ اســلم تسلم ۰ يؤتك الله اجرك مرتين فان توليت فــان عليك اثم الاريسيين ويا أهل الكتاب تعالوا الى كلمة ســواء بيننـــا وبينكم ۰ ان لا نعبد الا الله ولا نشرك به شيئا ۰ ولا يتخـــذ بعضا بعضا أربابا من دون الله فان تولوا فقولوا اشـــهدوا بانا مسلمون ۰

### ( تەرجەمەی کاغەزی پێغەمبـــەر
### صلی الله تعالی علیه وسلم کەبۆ هیرەقلی ناردووە )

١ ڕیوایەت کراوە لە ابن عەباس بسم الله الرحمن الرحيم ۰ لەمحمد کە بەندەی خودایە و پێغەمبەری خودایە ۰ بۆلای هیرەقل گەورەی رووم۰ سەلام لەوکەسەبی کەتابعی هیدایەت بووە ۰ پاشان من دەعوەتت دەکـــەم بەدەعوەتی دینی ئیسلام ۰ موسولمان بەسەلامەت دەبی ۰ خودا دووقــــەد

پاداشتت دەدا • ئەگەر لەدینی ئیسلام ڕووت وەربگێری • بێشك لەسەر تۆیە گوناهی خەدەمو دەستەو دائرەی خۆتو ڕەعیە• ئەی ئەهلی کتاب وەرن بۆکلمەی تەوحید کەلەبەینی ئێمەو ــ لەبەینی ئێوە نسبەتی بەمساواتە• بەم صورەتە عبادەتی غەیری خودای عظیم الشأن نەکەین • هیــچ شــتێکیش نەگێرین بەشریکی ئەو لە امتثالی ئەمرو نەهی وە هەندیکتمان هەندیکمان نەگێری بە بەخێوکەرو پەرستراو ( مەعبوود ) • لەغەیری خودای گەورە• ئەگەر ئەهلی کتاب لەم دەعوەتە ڕوو وەربگێرن ئێوە ڕاستەوخۆ بــەوان بلێن • ئێوە شاهدبن ئێمە سلمانین مەعنا موطیعین وتەسلیمین بۆئەوامری خودا وە دوور کەوتنەوە لەخراپە •

---

( كتاب الايمــان )

بەشی باوەڕی

**٢ عن ابن عمر • بني الاسلام على خمس شهادة أن لا اله الا الله وان محمــــدا رسول الله • واقام الصلوة • وايتاء الزكاة • والحج • وصوم رمضان •**

( تەرجــەمە )

٢ لە ابن عمر ڕیوایەت کراوە • دینی ئیسلام لەسەر پێنج شــت دروست کراوە • ١ــ بەزمان اعتراف بکەی بەدلیش بــاوەڕ بکــەی • کەبەحەقیقەت هیچ پەرستراوێك نیە خودا نەبێ • وە بەبێ گومانیش محمد پێغەمبەری خودایە • ٢ ــ دووەم نوێژکردنە ٣ ــ سێیەم زەکات دانــە

بەموستەحەقان ٤ ــ چوارەم حەجە ٥ ــ پێنجـــەم بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزانە •

---

**٣ عن ابي هريرة : الايمان بضع وســتون شــعبة والحياء شعبة من الايمان •**

( تەرجـــەمە )

٣ لە ئەبو هورەیرە ڕیوایەت کراوە کەئیمان شـــەصتو ئەمەندە لقەیە حەیاش لقێکی ئیمانە ( واتە باوەڕی‌یە بەخودا ) •

---

**٤ عن عبدالله ابن عمرو • المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده • والمهاجر ما نهى الله عنه •**

( تەرجـــەمە )

٤ لەعبـــداللەی کوڕی عـــەمر ــ ڕیوایەت کراوە • کەموســـلمان ئەوکەسەیە کەعالەمی اسلام لەزمانو دەستی ئەو سەلامەت‌بن • موهاجریش ئەوکەسەیە تەرکی کردبی هەرچی خودا داوای کردبی کەنەکرێ واتە نەهی لێ کردووە •

---

**٥ عن ابي موسى : من ســـلم المسلمون من لســانــه ويده قاله لما سئل اي الاسلام افضل •**

( تەرجـەمە )

ئەبوو موسی ڕیوایەت کراوە کـە وەقتێ ـ ئەصحـــابی کـیرام
. تەهاوڕێ بەڕێزەکانی پەغەمبەر پرسیان کەگەورەترینی ئیســلام کێیە :
ـە رمووی ئەوکەسەیە کەموسلمان لەزمانو دەستی ئەو سەلامەت بن •

---

٦ عن عبـــدالله ابن عمرو • تطعم الطعـام وتقـرء
السـلام على من عرفت ومن لم تعرف قاله لمـا سـئل أي
الاسلام خير •

( تەرجـەمە )

٦ لەعبدالله‌ی کوڕی عەمر : ڕیوایـەت کراوە یەکێـك پرســی
ڕسوڵ الله باشترینی ئیسلام کێیە فـەرمووی خواردنداە بەخەڵـکیو
سلامکردنە لەهەرکەسی بیناسی یاخۆ نەیناسی •

---

٧ عن انس : لا يؤمن احدكم حتى يحب لاخيه مايحب
لنفسه •

( تەرجـەمە )

٧ لەئەنەس دەگیڕنەوە کە پێغەمبـەر فەرمووی ـ نابنـە مؤمن
و تەباوەڕدار ) • هیچ یەکێك لـەئێوە • هەتـابۆبرای ئیمـــانداری
نەخۆشدەبی ئەوشتی کەبۆ خۆی پێی خۆشـە ( یەعنی ئەگـــەر وابێ
وەڕداری تەواوە ئەگەرنا تەواونییە •

٨ عن أبي هريرة : فوالذي نفسي بيـــده لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده • وفي رواية أنس زيادة والناس اجمعين •

( تەرجـەمە )

٨ لەئەبوو هورەیرە ڕیوایەت کراوە • قەسەم بـەو خودایەی کەنەفسی من بەدەست ئەوە نابی بەمؤمنی کامل ( باوەڕداری تەواو ) هیچ یەکێك لەئێوە هەتامنی لاخۆشەویستتردەبێ لەباوکیو لەمنالی خۆی •ئەم حەدیثە لەئەنەسیش ڕیوایەت کراوە بەلام بەزیادەی لەهـەموو ناسێك یەعنی دەبی من لای ئەو لەهەموو کەس • خۆشەویستتربم • ئنجـا باوەڕی تەواوە • ئەگەرنا باوەڕی ناتەواوە •

---

٩ عن أنس : ثلث من كن فيه وجـد حلاة الايمان يكون الله ورسوله أليه مما سواهما وان يحب المرء لا يحبه الا لله وان يكره أن يعود في الكفر كما يكره ان يقذف في النار •

( تەرجـەمە )

٩ لەئەنەس ڕیوایەت کراوە سێخەسلەت هەیە هەرکەسی ئـــەو خەسلەتەی تیامەوجودبی ــ شیرنی ئیمـــانی بۆدەبی ( یەکی‌یـــان ) خودا و پێغەمبەری خودای ( کەمحمدە ) لەهەمووکەس خۆشتربوێ •

دووەم : هەروەقتێك پیاوێکت خۆش‌ویســـت لەبۆهیچ ئامانجەکی دونیابی ئەبێ بەلکوو هەر تەنیا لەبۆخودا خۆشت بوێ •

سێیەم ــ چلۆن پێت ناخۆشە فڕەبدرێیە ناوئاگر بسووتێی پێشت
خۆشەبی بگەرێیەوە بۆکافری • یەعنی ئەم سێ صفەتە لەهەرکەسێك هەبێ
ئەمی شیرفایەتی ئیمانی کردووە •

**١٠ عن أنس آية الايمان حب الأنصار • وآية النفاق بغض الانصار •**

( تەرجـەمە )

١٠ لەئەنەس ڕیوایەت کراوە • نیشانەی ئیمـــان خۆشویستنی ئەنصاری‌یەکانی بەڕێزن ( واتە ئەوموسولمانانەی خەلکی مەدینەبوون یارمەتی پێغەمبەریاندا ) •

نیشانەی نیفاقیش ڕك لێبوونەوەیە لەئەنصار •

**١١ عن عبادة ابن الصامت :**

**بايعوني على ان لا تشركوا بالله شيئا • ولا تسرقوا ولا تزنوا ولا تقتلوا اولادكم ولا تاتوا ببهتان تفترونه بين ايديكم وارجلكم • ولا تعصوا في معروف فمن وفى منكم فاجـره على الله ومن اصاب من ذلك شيئا • فعوقب في الدنيا فهو كفارة له • ومن اصاب من ذلك ثم ســتره الله فهو الى الله ان شاء عفا عنه وان شاء عاقبه •**

( تەرجـەمە )

١١ لە عبادەی کوڕی صامت ڕیوایەت‌کراوە پێغەمبەر صلى الله

تعالى عليه وسلم • وەقتێك كە ئەصحابی كیرام لەخدمەتی دانیشتبوون بە
ڕوو بەهەموویانی گوت • ئەی ئەصحابی من ئێوە بەیعەت بەمن بكەن لە
ئەمە كەهیچ شتێك نەگێرن بەشریكیخوداو دزی نەكـەن وە زینـا نە
وەمناڵەكانتان نەكوژن • وە بوختان مەكەن واتە بەدرۆ افترا ڕێكبخـ
لەبەینی دەستەكانو قاچەكانتان وە یاخیمەبن لەهیچ شتێك كەلەشەریعە
ئیسـلامبێ •

ئنجا هەر كەسێك ئەم بەیعەتەی من بەجێگەیاند • پاداشتەو كرێ
ئەو لەسەرخودایە • وە هەركەسێكیش تووشی گوناهێك بوو لەمـانە
گوتراو ( غەیری دۆزینەوەی هاوبەش بۆخودا ــ واتە ــ شرك ) • لەدو
عەزاب دەدرێ بەحەدی شەرعی بەو حەدەش لەگوناهەكە پاك دەبێتەوە
هەركەسێكێش تووشی گوناهێك بوو لەمانە پاشان خودا لەعالەمی داپۆش
گوناهەكە •

ئەمە جەزایەكەی عائد بەخودایە • ئەگەر ویستی عەفووی دەكا ئەگە
ویستیشی عەزابی دەدا •

ئەوەی ئەم حەدیثە دەگێڕتەوە كەعوبادەیە فەرمووێتی لەسـەر دوو
كەوتنەوە لەمانەی گوتراو بەیعەتمانكرد •

---

**١٢ عن أبي سعيد الخدري : يوشـك ان يكون خير مال المسلم غنما يتبع بها شـعف الجبال ومواقع القطر يفر بدينه من الفتن •**

( تەرجـــەمە )

١٢ لە ئەبو سەعیـــدی خودری ریوایەت کراوە • نزیك دەبی کەباشترینی مالی مسلمان پارچە مەرِێك بی• کەبکەوێتە شوێن پارچەمەرِەکەی سەر کێوان • وە ئەوعاردانەی کەبارانی گرە • رابکا بەدینەکەی خۆیەوە لەفتنەو حەوادث • یەعنی شوان لەگەل خەلکی تێکـەلاوی نیە تەنیـایە هەرخەریکی لەوە راندنی حەیوانەکەی خۆیەتی ئەتوانێ دینەکەی بپارێزی لەفتنەوخراپە •

لەچاکەی ــ تێکەلێ نەبوون لەگەل خەلك ( عزلة ) لەشەرحی حەدیثی ــ (٧٠٨) لەسەرەتای بەرگی‌دووەم تەماشابکە اشکال نامینێ •

---

## ١٣ عن عائشة رضي الله تعـالى عنها • قالت كان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا أمرهم امرهم من الاعمال بما يطيقون • قالوا انا لسنا كهيئتك يا رسول الله ان الله قد غفر لك ما تقدم من ذنبك وما تاخر • فيغضب حتى يعرف الغضب في وجهه ثم يقول ان اتقـاكم واعلمكم بالله أنــا •

( تەرجـــەمە )

١٣ رِیوایەت کراوە لەدایکی ئیماندار عائشە رِەزای خوای‌لێ‌بی حالی پێغەمبەری خودا وابوو صلی الله تعالی علیه وسلم وەکوو ئەمرێکی بەئەصحاب بکردایە لەوکارانەی ئەمری پێ‌دەکردن• کەلەتاقەت‌و توانای ئەوان

بوایە ئەصحابی کیرام دەیانگوت یا رسول الله • ئێمــە وەکوو تۆنین مــالْ شەئنی تۆ لەســــەرەوەی عالەمە • چونکی بــەبێ گومــــان خودا تۆیْ عەفووکردووە لەگوناهی پێشوو پاشوو ئنجا پێغەمبەر صلی الله تعالی علیْ وسلم • ڕقی دەبۆوە هەتا ئارەقە لەڕووی پیرۆزی دیار دەکرا پاشان دەیْ فەرموو بەڕاستی ئەوەی لەئێوە زیاتر لەخودا بترسێ زاناتر لەئێوە بەخودایْ گەورەمنم •

( موورادی ئەصحاب ئەمەبوو لەپێغەمبەریان دەویست عەمەلی زۆرو کاری بەئەزیەتی‌یان ئەمر پێ‌بکا بەلام پێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وســلم قسەکەی ئەوانی ڕەد کردەوە •

---

**١٤ عن ابي ســعيد الخدري : عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال يدخل اهل الجنة الجنة • واهل النار النار ثم يقول الله تعالى اخرجوا من كان في قلبه مثقال حبة من خردل من ايمان فيخرجون منها قد اســودوا فيلقون في نهر الحياء أو الحيــاة فينبتون كما تنبت الحبــة في جــانب السيل • ألم تر انها تخرج صفرا ملتوية •**

**( تەرجــەمە )**

١٤ ڕیوایەت کراوە لە ئەبوو سەعیدی خودری ــ ڕەزای خودای لێ‌بێ کەپێغەمبەر صلی الله تعالی علیه وسلم گوتی : ئەهلی بەهەشـــــت دەچنە ناو بەهەشت ئەهلی ئاگریش دەچیتە ناو ئاگر •پاشان خودای گەورە• ڕاستەوخو ئەمر دەکاتە مەلائیکەی بەڕێز •

لەئاگر بێننە دەر   هەرکەسێك بەقەدەر دنکە غەردالەیێك ئیمـــانی لە ناو دل هەبێ • ئنجا لە ئاگر  دەیان هێننە دەرێ لە حـــالەتێك زۆر ڕەش داگەڕاون • ئنجا دەیان خەنە ناو ڕووباری ڕەحمەت یاخۆ ڕووباری حەیاتی هەتا هەتایە ) •

ئنجا شین دەبنەوە وەکووشین بوونە وەی دانەیێك کە لەخاشـــاکو خشتو خالی ڕۆخی لێشاو لەتەڕو تازەیی کەوابی لەڕۆخی لێشاو چەند زوو بەبەرزی دەردەچی بەزەردیو بەناسکی لار دەبێتەوە •

---

## ١٥     وعنه رضي الله تعالى عنه قال

**قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • بينما انا نائم رأيت الناس يعرضون علي وعليهم قميص منها ما يبلغ الثدي ومنها ما دون ذلك وعرض علي عمـر ابن الخطـاب وعليه قميص يجره قالوا فما اولت يا رسول الله قال الدين •**

( تەرجـمەمە )

١٥     دووبارە ڕیوایەتکراوە لە ئەبوســـەعیدی خودری ڕەزای خودای لێبی گوتی فەرمووی  پێغەمبەری خودا • صلى الله تعـــالى عليه وسلم  وەقتێك من نووستبووم لەخەو دیتم جەماعەتی خەلـــکی نیشانی من دەدرا  وکراسیان لەبەردابوو هەتـــا  مەمکیـــان بوو • هەندیکیشـــیان کورتتربوو ــ عومەری کوڕی خەطابیش ( ڕەزای خودای لێبی )نیشانیمن درا کراسێکی لەبەربوو لەسەر عارد ڕایدەکێشا • گوتیان یا رسول الله • ئنجا تۆ چلۆنت تەعبیر لێداوە • فەرمووی تەئویلم کرد بەدین •

---

**١٦ عن ابن عمر رضي الله عنهما . أن رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم مر على رجل من الانصار وهو يعظ اخاه في الحياء . فقال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم دعه فان الحياء من الايمان .**

**( تەرجەمە )**

١٦ ریوایەت كراوە لە ابن عمر ڕەزای خودایان لێ بی کە پێغەمبەر صلی اللہ تعالی علیه وسلم بەلای پیاوێکی خەلکی مەدینەدا تێپەڕی . بۆ ڕای خۆی ئامۆژگاری دەکرد پێی دەگوت بۆچ ئەمەندە شەرمنی هەرکەسێك زۆر بەشەرم بێ حقوقی خۆی پێ ناپارێزرێ . پێغەمبەریش فەرمووی .

وازی لێبێنە چونکی شەرمو حەیا لەئیمانە یەعنی چلۆن ئیمان مەنعی دەکا لەگوناە کردن شەرمیش مەنعی دەکا .

---

**١٧ وعنه رضي الله عنه ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال أمرت ان اقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله ويقيموا الصلواة ويؤتوا الزكاة . فاذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم الا بحق الاسلام وحسابهم على الله .**

**( تەرجەمە )**

١٧ دووبارە لە ابن عمر رەزای خودایان لێ بی دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر صلی اللہ تعالی علیه وسلم فەرمووی . من ئەمرم پێ کراوە لەلایەن خودا .

کەکوشتاری کافران بکەم هەتا بەزمان شاهێدی دەدەن کەهیچ پەرستراوی ڕاست نییە خودا نەبێ • ومحمدیش ناردراوی خودایە • بۆ تـەبلیغی ــ ئەحکامی دین بەعالەم • وەزەکاتیش دەدەن • ئنجـــا وەکوو ئەمانەیـــان بەجێ گەیاندا بوون و مالی خۆیان لەچەنگ من نەجات دەدەن • ئیلا مەگەر بە حقوقی عبادو حدودی شەرعیە نەبی • وەکوو حدودی قەتل(کوشتن‌و) زیناو تەرکی نوێژ ــ واتە نوێژ نەکردن وە غەرامەت‌و تۆلەی ئەو شـــتەی فەوتاندرابێ • وەحسابی نهێنییەکانی ناو دلیشیان لەلایەن خودایــە یەعنی چونکی ئێمە تەنیا ئەمر بەظاهر دەکەین • ( واتە ئەوشتەی لەبەرچاودیارە )•

---

**١٨ عن أبي هريرة رضي الله عنه سئل اي العمل أفضل قال • ايمان بالله ورســـوله قيل ثم ماذا قال حج مبرور •**

**( تەرجـــمە )**

١٨ لە ئەبو هورەیرە ریوایەت کراوە سؤال کرا لەپێغەمبەر کامـــە کار گەورەترین هەموو کارێکە • فەرمووی باووڕکردن بە خودا کەکارێکی وایە بەدل دەکرێ • پێی گوترا لەپاش ئەو چی گەورەترە فەرمووی غـــەزا لەڕێگای دینی خودا • پێی گوترا لەپاش جهاد • فەرمووی حەجی خالص لەگوناه وریا لەغەیری ئەم دووە گەورەترە •

---

**١٩ عن ســـعد ابن أبي وقاص رضي الله عنـــه ان رســـول الله صلى الله تعالى عليـــه وســـلم اعطى رهطـــا**

وسعد جالس فترك رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم رجلا . هو أعجبهم الي فقلت يا رسول الله ما لك عن فلان فوالله اني لاراه مؤمنا فقال أو مسلما فسكت قليلاثم غلبني ما أعلم منه فعدت لمقالتي فقلت ما لك عن فلان فوالله اني لاراه مؤمنا فقال أو مسلما فسكت قليلا ثم غلبني . ما أعلم منه فعدت لمقالتي وعاد رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ثم قال . يا سعد اني لاعطي الرجل وغيره أحب الي منه خشية ان يكبه الله في النار .

( تەرجـــەمە )

١٩ ڕیوایەت کراوە لەسەعد کوڕی ابی وەقاص ڕەزای خودای لێ بێ کەپێغەمبەر (ص) مالی دەبەخشی بەجەماعەتێك سەعدیش دانیشتبوو پێغەمبەر (د.خ) لەوجەماعەتە بەپیاوێکی نەدا . کەلەو جەماعەتە ئەو پیاوەم پێ لەهەموان باشتربوو گوتم یارەسوول بۆچی فلانت تەرك‌کرد قەسەم بەخودا من بەئیمانداری دەبینم . پێغەمبەر فەرمووی یابەموسولمانی دەبینی سکوتم کرد کەمێك پاشان استحقاقی ئەوپیاوە غەلەبەی لەســــەر کردم دووبارە گوتم بۆچی ئەم پیاوەت تەرك کرد واللەبەمؤمنی دەبینم . پێغەمبەر فەرمووی یا بە مسلمی دەبینی منیش سکوتم کرد دووبارە استحقاقی پیاوەکەی غەلەبەی لەسەر کردم گوتم بۆفلانت تەرك کرد . پێغەمبەریش قسەی خۆی دووبارە کردەوە . پاشان فەرمووی یاسەعد من پیاو هەیە پێی دەدەم غەیری ئەویشم خۆش‌دەوێ لەترسی ئەمە نەوەك خودا لەسەر ڕوو بیخاتە نـــاو ئاگر ( چونکی ئەگەر پێی نەدرێ دەگەڕێتەوە لەاسلام دەبێتەوە کافر ) .

پێغەمبەر لەبەر ئەوە وەلامی سەعدی بە ( او مسلما ) دایەوە • چونکە ئیمان شتەکی قەلبی‌یە ناتوانرێ جەزمی لەسەر بکرێ بەلام دەتوانرێ بگوترێ موسولمانە دەبوایە سعد ـ ڕەزای خوای لێ‌بێ بی‌گوتبایە بەموسولمانی باشی دەبینم •

---

**٢٠ عن ابن عباس قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم أريت النار فاذا أكثر أهلها النساء يكفر • قيل ايكفرن بالله • قال يكفرن العشير ويكفرن الاحسان لو احسنت الى احداهن الدهر ثم رأت منك شيئاقالت مارأيت منك خيرا قط •**

**( تەرجەمە )**

٢٠ ڕیوایەت کراوە لە ابن عباس گوتی • فەرمووی پێغەمبەر (د) نیشانم درا ئاگر لەناکاو دیتم زۆرترینی ئەهلی ئاگر ئافرەت بوون چونکی کفردەکەن•عەرزیان کرد چما انکاری خودا دەکەن•فەرمووی انکاری چاکەی خێری مێردی خۆیانو ئەقاربو عەشیرەتی خۆیان دەکەن وە انکاری ئەو نازو نیعمەتەی دەکەن کەلەگەلیان دەکرێ مثلا ئەگەر تو زەمانێکی زۆر چاکە لەگەل یەکیکیان بکەی • پاشان شتێکی مخالفی طبعی خۆی لەتۆ بینی دەلێ بەقەطعی هیچ چاکەم لەتۆ نەدیوە •

---

**٢١ عن أبي ذر رضي الله عنه قال سابيت رجلا فعيرته بأمه فقال لي النبي صلى الله تعالى عليه وسلم يا أبا ذر أعيرته بامه لانك امرء فيك جاهلية اخوانكم خولكم جعلهم**

**الله تحت أيديكم . فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل وليلبسه مما يلبس ولا تكلفوهم ما يغلبهم فان كلفتموهم فاعينوهم .**

( تەرجـەمە )

٢١ ڕیوایەت کراوە لەئەبو ذەر گوتی لەگەل پیاوێك جنێومان بەیەکتریدا . لای هەندێکان ( بلال )بوو . لای هەندێکانیش پیاوێك بوو خۆی ئەسیری کردبو خدمەتی خۆی پێدەکرد منیش بەدایکی عەیبم لێ گرت. گوتم دایکت ڕەشە .

پێغەمبەر (د) پێی گوتم بەدایکی عەیبی دینیەسەرێ : تۆ پیاوێکی ئەثەری جاهلیەت لەتۆدا هەیە . خدمەتـ کارەکانی ئێوە بـرای ئێوەن ( یەعنی لەدین ) . خودا ئەوانی خستوونە ژێردەستی ئێوە . ئنجاکەسـێك برای خۆی لەژێر دەستی بێ لایقە بەخۆی چی‌دەخوا دەرخواردی برایشی بدا . بەخۆی چی لەبەر دەکا ئەو شـتەش لەبەر ئەو بکا . تەکلیفیکیشیان بەکارێکی والێ نەکرێ . لەفەوقی تاقەتی خۆیان بی . ئەگەر ئەو تەکایفەشتان لێ کردن یاریدەیان بدەن .

---

**٢٢ عن أبي بكر رضي الله تعالى عنـه قال سـمعت رسول الله (ص) اذا التقـا المسلمان بسيفهما فالقـاتل والمقتول في النار فقلت يا رسول الله هـذا القاتل فما بـال المقتول . قال انه كان حريصا على قتل صاحبه .**

( تەرجـەمە )

ڕیوایەت کراوە لەئەبوبکری صدیق ( ڕەزای ) خوای لێ بێ • گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) دەی فەرموو • وەکوو دوومسلمان بەشیری خۆیانەوە گەیشتنە یەکتری — ئەوەی دەکوژێ و ئەوەی دەکوژرێ لەئاگرن • گوتم یا رسول الله ئەمەی دەکوژێ ئەوە جێی خۆیەتی • ئەدی ئەوی دەکوژرێ بۆچی ؟ فەرمووی چونکی ڕشت بووە لەسەر کوشتنی دوژمنەکەی •

---

**٢٣ عن عبـدالله ابن مسعود رضي الله عنـه عن النبي (ص) قال لما نزلت الذين آمنوا ولم يلبسوا ايمـانهم بظلم • قال اصحاب رسول الله (ص) أينا لم يظلم فانزل الله تعالى ان الشرك لظلم عظيم •**

( تەرجـەمە )

٢٣ ڕیوایەت کراوە لەعبداللەی ابن مەسعود ڕەزای خودای لێ بێ ئەویش لەپێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو ئایەتی [ الذين آمنوا ولم يلبسوا ايمانهم بظلم ] هاتەخوارێ • ئەصحابەی — پێغەمبەری گۆتیان کێ بێ لەئێمە ستەمی نەکردبێ زولمی نەکردبێ ( هەتا کەلك وەرگرێ بەئەمین بوونو بـەم ڕێ بزرنەکردنە ) • چونکی تەواوی ئایـــەت دەلێ ( اولئك لهم الامن وهم مهتدون ) • ئنجا خودای گەورە تەخصیصی کرد زولمی عام (ستەمی گشتی)• لەئایەت بەزولمی خصوصی کە هاوبەش دۆزینەوەیە بۆخودا [ شرك] لەئایەتی پاشوو فەرمووی ( ان الشرك لظلم عظيم ) •

ئەمە موژدەیەکی زۆر گەورەیە بۆئیماندار •

**٢٤ عن ابي هريرة رضي الله تعالى عنــه عن النبي (ص) قال : آية المنافق ثلث . اذا حدث كذب . واذا وعــد أخلف . واذا أؤتمن خان .**

( تەرجــەمە )

٢٤ لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە . فەرمووی پێغەمبــەر ( د ) نیشانەی منافق ( دووڕوو ) سێشتە یەکێیان لەکاتی قسەکردن درۆبکا ( دووەم ) وەکوو وەعدیش بدا ــ بەجێ نەگەیێنی . ئەمانەتیش پێ بسپێردرێ خیانەت بکا .

---

**٢٥ عن عبــدالله ابن عمر ( رضي الله عنهما ) . ان النبي (ص) قال أربع من كن فيه كان منافقا خالصا ومن كان فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعهــا اذا أئتمن خان . واذا حدث كذب . واذا عاهد غــدر واذا خاصم فجر .**

( تەرجــەمە )

٢٥ دەگێڕنەوە لەعبــداللەی ابن عومەر ڕەزای خودایان لێبێ فەرمووی . چوار خەسلەت هەیە هەرکەســێك تەواوی هــەرچواری تیامەوجودبێ منافقێکی خالصە . هەرکەسیش یەك خەســلەتی تیابێ لەم چوارە . لەوداهەیە ــ خەسلەتێك لە ( نفاق ) دووڕوویی . واتــە چارەکی منافقە . هەتا تەرکی دەکا . چوار خەسلەتەکانیش ئەمانەن یەکێیان وەکوو بەئەمیندار بزاندرێ خیانەت بکا .

دووەمیان : وەکوو قسە بکا لەکاتی قسەکردن درۆبکا •

سێیەمیان : وەکوو پەیمانێك ببەستێ بەبێوەفایی بەجێی ناگەینی •

چوارەمیان : وەکوو دوژمنایەتیش بکا بەدرۆ قسەی پووچ دەکاو جنێو دەدا •

---

**٢٦ عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم من يقم ليلة القدر ايمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه •**

**( تەرجەمە )**

٢٦ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە •

ڕەزای خودای لێبێ گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێك شەوی قەدرو شەرەف هوشیاربی بەطاعەت بەباوەڕیو تەنیا بۆ خودا ئەوەك بەڕیاء عەفوو دەکرێ لەهەموو گوناهی پێشووی •

---

**٢٧ وعنه رضي الله عنه عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال : انتدب الله لمن خرج في سبيله لا يخرجه الا ايمان بي وتصديق برسلي • ان ارجعه بما نال من اجر أو غنيمة • أو أدخله الجنة ولولا ان اشق على امتي ما قعدت خلف سرية • ولوددت اني اقتل ثم احيا ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل •**

( ته‌رجـه‌مه )

٢٧ له‌ئه‌بوو هوره‌یره ده‌گێڕنه‌وه ڕه‌زای خودای لێ‌بێ پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی (د) • خودای گه‌وره ته‌که‌فولی کردووه بۆ که‌سێك چوو بێته ده‌رێ بۆ کوشتاری کافران که‌ته‌نیا باوڕی به‌خوداو باوه‌ڕی به‌پێغه‌مبه‌ران ئه‌وی ده‌رخستبی بۆغه‌زای کافران ( به‌بێ غه‌ڕه‌زو تۆله بۆکردنه‌وه‌ك کــــه من بیگێڕمه‌وه بۆ نیشتمانی خۆی به‌هه‌رچی که‌ده‌ستی که‌وتووه له‌پاداشتی زۆر • یاغه‌نیمه‌ت‌و مال ( یه‌عنی ئه‌گه‌ر شه‌هیدنه‌کرا ) •

یاخۆ بیخه‌مه‌ناو خۆشی به‌هه‌شت • ( یه‌عنی ئه‌گه‌ر شه‌هیدکرا ) ئه‌گه‌ر له‌به‌ر زه‌حمه‌ت بوون نه‌بوایه به‌گوێره‌ی بێ‌هێزه‌کان له‌ئومه‌تی محمـــــد • که‌پێیان نه‌ده‌کرا بۆجهاد بچن ـــ وه‌دلیشیان به‌من ده‌دراوه له‌گه‌لیان دابم •

دانه‌ده‌نیشتم له‌پاش هیچ له‌شکرێك که‌بۆسه‌ر دوژمن بچی •

وه ئه‌کیده‌ن حه‌زیشم ده‌کرد که‌بکوژرێم •

پاشان زیندوو بکرابامایه‌وه پاشـــان بکوژرامایه‌وه پاشـــان زینـــدوو بکرامایه‌وه پاشان بکوژرامایه‌وه •

( یه‌عنی له‌به‌ر مه‌رحه‌مه‌ت به‌هه‌ژارانی ئومه‌تم ( که اسلامه )نه‌بوایــه که‌حه‌زیان لێ‌بوو له‌گه‌ل مندا بن دائما به‌رامبه‌ر دوژمن ڕاده‌وه‌ســــتام • وه به‌دوای شوێنی شه‌ڕی دوژمنم ده‌که‌وتم • ( واته ته‌عقیبی مه‌واقعی حه‌ربی دوژمنم ده‌کرد • ) •

---

**٢٨ وعنه رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم من صام رمضان ايمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه •**

( تەرجـەمە )

٢٨ دوو بارە دەگێڕنەوە لە ئەبی‌هورەیرە رەزای خوای لێ بێ ٠
ئەی فەرموو پێغەمبەر دەی فەرموو ٠
( هەرکەسێك مانگی رەمەزان بەرۆژوبێ بـەبێ ٠ رِیـــا بۆخودا ٠
ئەدەپۆشرێ هەموو گوناهی پێشووی ٠ لەلایەکی تر هەر لەئەبوو هورەیرە
دەگێڕنەوە ( من قام ) لەجیاتی ( من صام ) ٠ واتە هەرکەس هەستێتەوە
رەمەزان جا لەبەر بەهێزی هەردوو ئیسنادیش ٠ هەردوو حەدیسیش پاکن
لەغەش و عەیب ) ٠

---

**٢٩ وعنه ايضا رضي الله عنــه ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال : ان الدين يسر ولن يشاد الدين احد الا غلبه فسددوا وقاربوا وابشروا واستعينوا بالغـــدوة والروحة وشيء من الدلجة ٠**

( تەرجـەمە )

٢٩ دیسان لەئـەبی هورەیرە رەزای خودای لێ‌بێ دەگێڕنەوە ٠
بەراستی پێغەمبەر فەرمووی ٠ بەراستی دین ئاسانە هیچ کەس رکەی لەگەل
دین ناکا کەبگاتە دەرەجەی هەرەبەرز مەگەر هەردین لەسەر ئەو غالب دەبێ
( چونکی مادام پێغەمبەر فەرمووی (د) لا احصى ثناء عليك انت كما اثنيت
على نفسك ـ گەیشتن بە بەبەرزترین پاەکانی دین نامسکنە ٠ واتە ( نابێ )٠
ئنجا خۆتان بەملاحظەی اوسط ( واتە ناوەنجی ) بەمەحکەمی رابگرن ٠

ڤیندارییەکی واش بکەن کەلەپلە هەرە بەرزەکانی دین بەنزیك بکەونەوە ٠ ( چونکی هەرناگەنە پلە هەرەبەرزەکان )٠وە بەشەوق و ڕووەکی خۆش بن لەسەر دین ٠ وە داوای یارمەتیش لەخودابکەن بەسـبەینەو بەئێوارە وە بەکەمێك پێشی بەیان ( فجر ) یەعنی ئەم سێ وەقتە پیرۆزە زیندووبکەنەوە بەیادی خوداو خوایەرستی ( طاعەت ) مەیانمرێنن بە ( غەفلەت ) ٠

---

**٣٠ عن أبي سعيد الخدري انه سمع رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول اذا أسـلم العبد فحسـن اسلامه يكفر الله عنه كل سيئة كان زلفها وكان بعـد ذلك القصاص الحسنة بعشر أمثالها الى سبعمأة ضعف والسيئة بمثلها الا ان يتجاوز الله عنها ٠**

٣٠ دەگێڕنەوە لەئەبووسەعیدی خودری بەڕاستی بیستی لەپێغەمبەر دەی فەرموو ٠ وەکوو عەبدێك موسولمان بوو دینی خۆشی باش بڕاگـرت خودای گەورە هەموو گوناهێکی دادەپۆشی کەلەپێشدا کردوویەتی٠ پاشان پاداشی خێرو شەڕی ئەو عەبدەش ٠ هەریەك خێر بەدە (١٠) ٠ هەتایـەك بە حەوت سەد [٧٠٠] ٠ گوناهیش یەك بەیەکە ئەگەر خودا عەفووی نەکـا ئەگەرنا گوناهەکەیشی بێجەزایە ) ٠

---

**٣١ عن عائشة رضي الله تعالى عنها ان النبي صلى الله تعـالى عليه وسلم دخل عليها وعنـدها امرأة فقال من هذه : قالت فلانة تذكر من صلاتها ٠ قال مـه عليكم بمـا تطيقون ٠ فوالله لا يمل الله حتى تملوا وكان احب الدين اليه ما داوم عليه صاحبه ٠**

( تەرجــەمە )

٣١ لە حەزرەتی عائشە دەگێڕنەوە کەدایکی ئیماندارانە ڕەزای خوای لێ بێ • کە پێغەمبەر چووە لای ئافرەتێکیشی لاهەبوو • فەرمووی ئەو ئافرەتە کێیە • گوتی فلانکەسە • زۆر نوێژ دەکا • فەرمووی ووس بە• ئەتێك لازمی ئێوەبێ لەقەدەر طاقەتی خوتان بێ • لێ عاجزو مەلوول نەبن• قەسەم بەخودا • خودا لەئێوە کز نابێ ( یەعنی پاداشتتان نابڕی ) •هەتائێوە کز نەبن یەعنی هەتا ئێوە قەطع نەکەن عەمەلی خۆتان لەبەر مەلولیو کزی• شیرینترین دین لای خودا ئەوەیە صاحیبی خۆی دەوامی لەسەری هەبێ •

---

**٣٢ عن انس رضي الله تعالى عنـــه عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال • يخرج من النار من قال لا الــه الا الله وفي قلبه وزن شعيرة من خير • ويخرج من النـــار من قال لا اله الا الله وفي قلبه وزن برة من خير ويخرج من النار من قال لا اله الا الله وفي قلبه وزن ذرة من خير •**

( تەرجــەمە )

٣٢ لەئەنەس دەگێڕنەوە ڕەزای خوای لێ بێ • پێغـــەمبەر ( د ) فەرمووی • دێتە دەرێ لەئاگر هەر کەسێك گوتبێتی لا اله الا الله لە نـــاو دلیشی بە قەدەر دنکە جۆیەك چاکە هەبێ • ( یەعنی ئیمان هەبێ ) •

دەشێتە دەرێ لە ئاگر هەرکەسێك گوتبێتی لا اله الا الله لەناو دلیشی بەگرانایی گێرگەیەك ایمانی هەبێ •

---

٣٣ عن طلحة ابن عبيد الله رضي الله عنه يقول جاء من أهل نجد الى رسـول الله صلى الله عليه وسـلم ثائـر الرءس سمع دوي صوته ولا نفقه ما يقول حتى دنا فاذا هو يسئل عن الاسلام فقال رسـول الله (ص) خمس صلوة في اليوم والليلة فقال هل علي غيرها . قال لا الا ان تطوع . قال صلى الله تعالى عليه وسلم . الزكاة قـال هل علي غيرها . قال لا الا ان تطوع . قال فأدبر الرجل وهو يقول قال والله لا ازيد ولا انقص على هذا . قال صلى الله تعالى عليه وسلم . أفلح ان صدق .

( تەرجـەمە )

٣٣ دەگێرنەوە لە طەلحەی کوڕی عبیـــد الله ڕەزای خودای لێ بی دەیگوت پیاوێك لەئەهلی نەجد هاتە خدمەت پێغەمبەری خودا (د) . پرچی سەری گرژبوو متفرق‌بوو بەدەنگێکی زۆر قەبە قسەی دەکرد . بەلاَم لەبەر غەلبەی گەورەیی دەنگەکەی لەقسەکانی نەدەگەیشتین چی دەلێ ، هەتـا بەنزیك کـەوت . وەکوو دیتمـــان پرسـیار لەدینی ئیسـلام دەکـا . ئنجـا پێغـەمبەر ( د ) فـەرمووی . دین اسـلام لەشـەوو ڕۆژپێنج نوێژە : پیـاوەکە گوتی بێجگەلەم پێنجە چی‌تر هەیە پێغەمبەر (د) فەرمووی نا مەگەر بۆ خۆت سونەت بکەی هەیە هیچی‌تر پێغەمبەر (د) فـەرمووی ) . ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە پیاوەکە گوتی هیچی ترم لەسەرهەیە . فەرمووی زەکاتە پیاوەکە گوتی هیچی ترم لەسەرە ـ فەرمووی ( نا ) مەگەر بۆخۆت سونەت بکەی . طەلحە گوتی پیـــاوەکە . ڕووی لەئێمە وەرگێڕا وەدەی

گوت ـ قەسەم بەخودا لەمەندە زیاتر ناکەم وە کەمتریش ناکەم • پێغەمبەر (د) • فەرمووی نەجاتی بوو ئەگەر ڕاست بکا ( ئەم حەدیثە ڕەدە لەسەر حەنەفیەکان کەدەلێن ( وتر ) واجبە • ڕەدە لەاصطخریش لە شافعیەکان کەدەلێ نوێژی جێژنان فەرزی کیفایەیە •

---

**٣٤ عن ابن هريرة رضي الله عنه ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • قال من اتبع جنازة مسلم ايمانا واحتسابا وكان معه حتى يصلى عليه ويفرغ من دفنها فانه يرجع بقيراطين كل قيراط مثل احد • ومن صلى عليها ثم رجع قبل ان تدفن فانه يرجع بقيراط من الاجر •**

**( تەرجەمە )**

٣٤ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی بەڕاستی پێغەمبەر (د) • فەرمووی هەر کەسێك بکەوێتە دوای جەنازەی مسلمانێك بەباوەڕیو بەبێ ڕیا • لەگەلیشیدابی هەتانوێژی لەسەر دەکاو دەشرێتەوە بەڕاستی ئەم پیاوە دەگەڕێتەوە بەعوضێکی زۆر گەورە ( چونکی قیراط بەردێکی تەرازوو لەئەشیای بەقیمەت وەکوو یاقووتو مجەوهەرات) •

---

**٣٥ عن عبدالله ابن مسعود • ان النبي (ص) • قال سباب المسلم فسوق • وقتاله كفر •**

**( تەرجەمە )**

٣٥ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی

بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی جنێو بەیەکتری دانی مسلمان (دەرچوونە لەدین) • کوشتاریشیان لەگەل یەکتری کاری کافرانە •

---

**٣٦ عن عبادة ابن الصامت أن رسول الله (ص) خرج يخبر بليلة القدر فتلاحى رجلان من المسلمين فقال اني خرجت لاخبركم بليلة القدر وانه تلاحى فلان فرفعت وعسى ان يكون خير لكم التمسوها في السبع والتسع والخمس •**

**( تەرجەمە )**

٣٦ دەگێڕنەوە لەعبادەی کوڕی صامت • کەپێغەمبەر (د) بۆ تەعینی ( دیارکردنی) • شەوی قەدر لەحوجرەی خۆی هاتەدەرێ • پاشان دوو پیاوی موسولمان کێشەیان لێ‌پەیابوو • ئنجا پێغەمبەر فەرمووی من‌بۆیە دەرچووم کەبە ئێوە بلێم کامە شەوێکە ليلة القدر • فلان‌و فلانیش کێشەیان لێ‌پەیدابوو تەعینەکەم لەناودلی ڕەفع‌کرا ( واتەهەلگیرا نەما ) یەعنی لەبیرم چوو •• لایقە ئەوە بۆئێوە باشتربێ • داوای ليلة القدر بکەن لەبیست‌و حەوتی ڕەمەزان وە لەبست‌و نۆی ڕەمەزان وە لە بیست‌و پێنجی ڕەمەزان•

---

**٣٧ عن ابي هريرة رضي الله عنه قال كان رسول الله (ص) يوما بارزا للناس فاتاه رجل فقال ما الايمان قال ان تؤمن بالله وملائكته وبلقائه ورسله وتؤمن بالبعث • قال ما الاسلام قال الاسلام ان تعبد الله ولا تشرك به • وتقيم الصلوة • وتؤتي الزكاة المفروضة وتصوم رمضان قال ما**

**الاحسان قال ان تعبد الله كانك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك قال متى الساعة قال ما المسؤول عنها باعلم من السائل وساخبرك عن أشراطها اذا ولدت الامة ربها . واذا تطاول رعاة الابل البهم في البنيان في خمس لا يعلمهن الا الله . ثم تلا النبي (ص) ان الله عنده علم الساعة (الاية) .**

**ثم ادبر فقال ردوه فلم يروا شيئا . فقال هذا جبريل جاء يعلم الناس دينهم .**

**( تەرجـەمە )**

٣٧ دەگێڕنەوە لەئـەبوو هورەیـرە ڕەزای خودای لێ بێ گوتی ڕۆژێك پێغەمبەر (د) بەدیارکەوت بۆخەلکی .

پیاوێك هاتەلای گوتی ئیمان چی‌یە ؟

فەرمووی ئیمان ئەوەیە باووڕبکەی بەخوداو بەمەلائکـەی خوداو بەگەیشتنی لای خوداو پێغەمبەرانی خوداوە باووڕ بکەی بەزیندووبوونەوە گوتی ئیسلام چی‌یە .

فەرمووی اسلام ئەمەیە تەنیا خودا بپەرستی شریکی بۆ پەیدا نەکەی ونوێژی فەرزبکەی وەزەکاتی فەرز بدەی . وەمانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبی . گوتی چاکە چی‌یە .

گوتی ئەمەیە عبـــادەت بۆخودا بکەی گۆیـا دەی بینی . لای کەمی لایانوابی خودا ئەوان دەبینی . گوتی چی وەقتێك قیامەتە . فـــەرمووی ئەوەی سؤالی قیامەتی لێدەکرێ عالمتر نی‌یە لەوەی سؤال‌دەکا . نیشانەکانی

قیامەتیشی پێدەلێم ( یەکێیان ) دایك گەورەی خۆی لێدەبی • ( یەعنی زەمان وای بەسەردێ معاملەی کوڕ لەگەل دایك وەك موعامەلەی سیدوجاریەی لێدێ لەلێدانو جنێوو ئیش پێکردن • زاناکان زۆر مەعنای تریان لێداوەتەوە بەلام ئەم مەعنایە چونکی زۆر مطابقی ئەم زەمانەیە • اقتصار لەسەر ئەم مەعنایە اختیارکرا ) •

دووەم : شوانو وشتری مجهول النسب ( بەکوردی مرۆڤی ناکەس بەچە) • بەدرێژی ڕادەکێشنە بناکردنی قەسران • هاتنی ڕۆژی قیامەت یەکێك لەو پێنج شتەی کەنادیارە ــ کەلە آخری سورەی لوقمان خودا نەبی هیچ کەس نازانی •

پاشدان پێغەمبەر (د) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( ان الله عنده علم الساعة) لەپاش ئەم پرسیارانە پیاوەکەی پرسیاری دەکرد ڕووی وەرگێرا پێغەمبەر(د) فەرمووی بیگێڕنەوە جێ بەجێ هیچیان نەدیت • پاشان فەرمووی ئەمە جوبرائیل بوو هات خەلکی فێرە دین بکات •

---

**٣٨ عن النعمان ابن بشير رضي الله عنهما • قال سمعت رسول الله (ص) يقول : الحلال بيّن والحرام بيّن وبينهما مشبهات لا يعلمها كثير • فمن اتقى الشبهات فقد استبرأ بعرضه ودينه • ومن وقع في الشبهات كراع يرعى حول الحمى يوشك ان يواقعه • الا وان لكل ملك حمى • الا وان حمى الله في ارضه محارمه • الا وان في الجسد مضغة • فان صلحت صلح الجسد واذا فسدت فسد الجسد كله الا وهي القلب •**

( تەرجـــەمە )

٣٨ دەگێڕنەوە لەنعمانی کوڕی بشیر ڕەزای خودای لێ بی گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) دەیفەرموو •
شتی حەلال ئاشکرایە ، شتی حەرامیش ئاشکرایە لەبەینی ئەم دووانە مالی بەشوبهە هەیە • ئنجا ئەگەر کەسێك خۆی پارازت لەمالی بەـشوبهە بەڕاستی قورتاری کرد عەرزی خۆی دینی خۆی • وەئەگەر کەسێکیش کەوتە ناومالی بەشوبهە وەکوو شوانێکە حەیوان بلەوەڕێنی • لەئـەترافی پاوان نزیك دەبی کە حەیوانەکە بخاتە ناوپاوان • ئاگادار بە هـەر پاشایەك پاوانی هەیە •وەئاگادار بە پاوانی خواش لەعاردی خۆی ئەوشتانەیە کەحەرامن ئاگادار بە بەحەقیقەت لەناو لەشی مرۆڤ زارجوو گۆشتێك هەیە • ئەگەر ئەوباش بوو هەموو لەش باش دەبی وەئەگەر ئەویش خراپ بوو هەموو لەش خراپ دەبی • ئاگادار بە ئەم زارجووە گۆشتەش دڵە •

---

**٣٩ عن ابن عباس رضي الله تعالى عنـــه • قال ان وفد عبد القيس لمـــا أتوا النبي (ص) قال من القوم او من الوفد • قالوا ربيعة قال مرحبا بالقوم او بالوفد غير خزايـــا ولا ندامى • فقالوا يا رسول الله انا لا نستطيع ان ناتيك الا في الشهر الحرام وبيننا وبينك هـــذا الحي من كفار مضـــر فمرنا بأمر فصل نخبر به من ورائنا وندخل به الجنةوسالوه عن الاشربة فأمرهم باربع ونهاهم عن اربع • أمرهم بالايمان بالله وحده • قال اتدرون ما الايمان بالله وحده ؟• قالوا الله ورسوله أعلم • قال شهادة لا اله الا الله وحده لا شريك له**

وان محمدا رسول الله • واقام الصلوة • وايتـــاء الزكاة •
وصيام رمضان • وان من المغنم الخمس • ونهاهم عن اربع •
الحنتم • والدباء والنقير • والمزفت • وربمـــا قـــال المقير •
وقال احفظوها واخبروا بهن من وراءكم •

( تەرجـــەمە )

٣٩ـ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خوای لێ بی گوتی جەماعەتێك لەسوارانی قەبیلەی عبد القیس وەکوو هاتن بۆخلمەت پێغەمبەر (د) • فەرمووی ئەم قەومە : یائەم وەفدە کێن ؟ گوتیان لەعەشیرەتی ڕەبیعەی کوڕی قەیسین • فەرمووی مەرحەبا لەم قەومە • یالەم وەفــدە زەلیل نەبن بەشیمان نەبن قەومەکە عەرزیان کرد • ئێمە پێمان ناکرێ بۆلای تۆ بێین لەم مانگە نەبێ کەکوشتاری تیاحەرامە لەبەینی ئێمەو لەبەینی تۆش ئەم عەشیرەتە هەیە لەکوفاری ــ مضر ــ ئنجا ئەمرمان پێ بکە ئەمرێکی ئاشـــکراو بـــە تەفصیل ــ بەدوورودرێژی ــ خەبەر بدەین بەقەومەکەمان وەبەو خەبەرەش بچینە ناو بەهەشت • وەسؤالیان لەئەحوالی زەرفەکانی خواردنەوە لێ کرد • ئنجا ئەمری پێ کردن بەچوارشت • نەهی لێ کردن لەچوارشـــت • ئەمری پێ کردن باوەڕێنان بەخودا هەبی کەیەکە • فەرمووی ئەرێ ئەزانن ئیمـــان بەخودایەکەچی یە • گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا زاناترە • فــەرمووی بەدل باوەڕبکەن بەزمانیش بلێن • هیچ پەرستراوی ڕاستی نی یە خودانەبی • کە تەنیایە هیچ شریکی نی یە • محمدیش پێغەمبەری خودایە وە ئەمریشی پێ کردن •

بەنوێژ کردن وەبەزەکاتدان وەبەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان • لەپاش

ئەم چوار ئەمرە ئەمریشی پێ کردن • پێنجێکی تالانی مالی کافرانیش بدەن وەنەهیشی لێ کردن لەچوارشت • کەمەشروبات وەکوو ئاو لەجەرە نەکەن ، لەکودوو نەکەن لەبن دارخورما نەکەن • چونکی ئاوین لەمانە دەخواردەوە • وە لەزەرفێکیش نەکەن بەزفت سواق درابی • لەپاشان هەر بەفەرموودەی خۆی ئەمانەی هەموو نەسخ کرد •

چونکی نەهیەکەی لەبەر ئەمەبوو • ئەمـانە مەشـروباتی لەتـرێ و خورما ــ ئەم شتانە زوو دەیانگێرن ــ بە ( مسـکر ) واتە سەرخۆشکەر • وەفەرمووی ئەم قسانەی منتـان لەبیرنـەچێ • وە خەبـەریش بدەنە قەومەکەتان •

---

**٤٠ عن عمر رضي الله عنه • قال النبي (ص) انمـا الاعمال بالنيات وانما لكل امرء مانوى فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله ومن كانت هجرته الى دنيا يصيبها او امرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه •**

( تەرجـەمە )

٤٠ لەحەزرەتی عومەر دەگێرنەوە • پێغەمبـەر (د) فەرمووی بەحەقیقەت نیـە هیچ کارێك مەگـەر بەنیەتەوە جێی بـاوەڕیەو ( موعتەبەرە ) وەبەڕاستی نیە هیچ پیاوێکیش لەهەموو کارێك ئەوشتە نەبێ کەویستوویەتی •

کەوایە هەرکەسێك چوونی بۆخوداو پێغەمبەری خودا بووە • ئـەوا

چوونەکەی بۆخوداو پێغەمبەری خودابووە • یەعنی جەزای چاکەی لەسەر ئەوانە وە ئەگەر چوونەکەش بۆدونیابووە کەبۆی ببی •
یاخۆ بۆ ئافرەتێك بووە کەمارەی بکا ئەوە چوونەکەی بۆئەوشتەبووە کەبۆی چووە •

---

## ٤١ عن أبي مسعود عن النبي (ص) اذا انفق الرجل على أهله نفقة يحتسبها فهو له صدقة •

( تەرجــەمە )

٤١ دەگێڕنەوە لەئەبومەسعود ئەویش لەپێغەمبەری پێغەمبەر دەی فەرموو هەرکەسێك بۆعائلەو منالو کەسی خۆی مالێك خەرج بکــا بێ ڕیاوبە مەرامی ڕازیبوونی خودا • ئەم مالە بۆئەو صەدەقەیە (خێرە) •

---

## ٤٢ عن جرير ابن عبدالله البجلي : قال بايعت رسول الله (ص) على من اقام الصلوة وايتـــاء الزكاة والنصح لكل مسلم •

( تەرجــەمە )

٤٢ دەگێڕنەوە لەجەریری کوڕی عبداللەی بەجلی گوتی لەســەر دەستی فەخری عالەم محمد (د) بەیعەتی دینی اسلامم کرد • ( واتە بوومــە اسلام ) لەسەر نوێژکردنو زەکات دان وەئەمر بەچاکەو **نەهی** لەخراپــە بۆهەموو موسولمانێك •

## كتــاب العــلم

( باسى زانين )

بســم الله الرحمن الرحيم

## به ناوى خوداى ڕزقدەرى ڕەحمبــەر

**٤٣ عن أبي هريرة قال النبي (ص) بعــدما ســئله اعرابي عن الساعة في المجلس . اين السائل عن الساعة قال ها أنا يا رسول الله . قال اذا ضيعت الامانة فانتظر الساعة . فقال كيف أضعتها . قال اذا وسد الامر الى غير اهله فانتظر الساعة .**

( تەرجــەمە )

٤٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو هوڕەیرە ڕەزای خودای لێبی گوتی وەقتێك پێغەمبەر (د) لەمەجلیس وەعزی دەدا.عەرەبێکی بادیەنشین هاتە خدمەتی . گوتی کەی قیــامەت دێ . پێغەمبەر (د) لەسەر وەعزی خۆی دەوامیکرد . ئەهلیمەجلیس هەندێ گوتیان گوێی لێ بوو بــەلام ســـؤالەکەی پێ ناخۆش بوو بۆیە جوابی نەدایەوە . هەندیکیش وتیان گوێی لێنەبوو . هەتاوەعزەکەی تەواوکرد فەرمووی کوا ئەوەی سؤال دەکالەڕۆژی قیامەت عەرەب گوتی ها منم یا رسول الله . فەرمووی وەکوو ئەمانەت بەزایعدرا چاوەڕێی قیامەت بە گوتی بەزایع چوونی ئەمانەت چۆنە ڕ

فەرمووی وەکوو ئەوکارانەی پەیوەندی بە دین ( وەکوو خەلافەتو فەرمانداریو حوکم‌کردن لەنێوان خەلکی ) • کەوتە دەستی نائەھل ئەوکاتــە چاوەڕێی قیامەت‌بە •

---

**٤٤ عن عبدالله ابن عمرو : نادی رسول الله (ص) أن من الشجر سحر شجرة لا یسقط ورقها • وانها مثل المؤمن فحدثوني ما هي :فوقع الناس في شـــجر البوادي • قال عبدالله وقع في نفسي النخلة فاستحييت • ثم قالوا حدثنـــا ما هي یا رسول الله • قال هي النخلة •**

**( تەرجــەمە )**

٤٤ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ‌بێ گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی •

لەداران دارێك هەیە بەهیچ وەقتێك گەڵا ناوەرێنی ئەم دارەش وەکوو ئیمانداره لەفەوائد ( واته سوود وەرگرتن لێی )•

ئنجاپێم بلێن چی‌دارێکە • خەلکەکە بیریان کــردەوە کەدارو درەختی دەشت‌و شیوانە •

عبداللە گوتی کەوتە ناودلم ئەمەدار خورمایە پاشان شەرمم‌کرد قسەبکەم• پاشان عەرزی‌یان کرد پێمان بلێ ئەمە چی‌دارێکە ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی ئەمە دارخورمایە •

---

٤٥ عن عبدالله ابن عمرو : نادى رسـول الله (ص) بأعلى صوته ويل للاعقاب من النار مرتين او ثلاثا •

( تەرجـەمە )

٤٥ دەگێڕنەوە لەعبـدالله‌ی کوڕی عەمر ڕەزای خوای لێبی •
پێغەمبەر نەسەفەرێك لەئێمە کەوتە دوایی • نوێژی عەسریش بوو • ئێمەش دەست نوێژمان دەشووشت • قاچەکانمان باش ـ نەدەشـوشت لەبـەر ـ عەجەلەو پەلەکردن ـ بانگی فەرموو بەدەنگێکی بەرز • واوەیلاو عەزابی ئاگر بۆئەوکەسانەیە لەدەست نوێژ قاچیان باش ناشۆن • بەلـکی اکتفـا بەشووشتنەکی سەرسەری دەکەن •

---

٤٦ عن أنس (ض) قال النبي (ص) : قد أجبتك سل عما بدا لك اللهم نعم اللهم نعم لما سـأله أعرابي عن البعث والصلوة والصوم والزكاة •

( تەرجـەمە )

٤٦ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خوای لێبی •
گوتی وەقتێك ئێمە دانیشتبووین لەخلمەت پێغەمبەر (د) پیاوێکی سوار ووشترهاتە مزگەوت ووشترەکەی ( یخ ) کرد •
پاشان بەعەگالی لاقی ووشترەکەی بەستەوە •
پاشان گوتی کامەتان محمدە• پێغەمبەریش لەناو ئەصحاب پالی دابۆوە•

پێمان گوت ئەم پیاوەی ڕەنگ‌سپی پالی دادەتەوە محمدە • ئەعراب پێی
گوت ئەی کوڕی عبدالمطلب • چونکی پیاوەکە رعایەتی ئـەدەبی نەکرد •
پێغەمبەر ئەی فەرموو [ نعم ] • فەرمووی اجبتك ـ گوتی زۆر بەتونـدی
چەند سؤالێك دەکەم ڕقت لێم نەبێتەوە • فەرمووی هـــەرچی دەپرسی
بپرسە • گوتی ئەتوو خودای خۆتوو خودای عالەمی پێش‌خۆت خودا تۆی
ناردووە بۆهەموو خەلکی •

فەرمووی ـ اللهم نەعەم ـ واتە ئەرێ والله ـ گوتی ئەتوو خودا •
خودا ئەمری بەتۆ کردووە شەوو ڕۆژ پێنج نوێژبکەی فەرمووی ( اللهم نعم)
واتە ـ ئەرێ والله ـ گوتی تۆبیو خودا •

خودا ئەمری بەتۆکردووە سالی ـ ئەم مانگە بەڕۆژووبی ـ فەرمووی ـ
اللهم نعم ـ واتە ئەرێ والله ـ گوتی توبیو خودا خودا ئەمری بەتۆ کردووە
زەکات لەدەولەمەندان بستینی بدەیە هەژاران فەرمووی [ اللهم نعم ] واتە
ئەرێ والله •

پیاوەکە گوتی باوەڕم کرد بەهەرچی پێ‌هـاتووی منیش نـاردراوی
قەومەکەی خۆمم من [ ضحامم کوڕی ثعلبەم ] •
لەعەشیرەتی هەوازن لەقەبیلەی بەنی‌سەعدی بەنی بەکر •

---

**٤٧ عن ابي واقد الليثي (ض) قال رسول الله (ص) الا أخبركم عن النفر الثلاثة . أما أحـدهم فـآوى الى الله فآواه . وأما الاخر فاستحيا فاستحيا الله منه . وأما الاخر . فأعرض فأعرض الله عز وجل عنه .**

( تەرجــەمە )

٤٧ دەگێڕنەوە لەئەبی واقدی لەیثی (ض) پێغەمبەر (د) لەمزگەوت دانیشتبوو، خەلکیش لەخدمەتی بوون، لەناکاو سێ پیاو ڕوویان لەمەجلس کرد دوویان بۆلای پێغەمبەر چوون ، یەکیشیان ڕۆیشت ، پاشـــان دووەکان لەنزیك پێغەمبەر ڕاوەستان ، پاشدان یەکێکیان لە حەلقـەی مـەجلیس کەلەنێکی دوزیەوە دانیشت لەوێ ، ئەویتریان لەپشت مەجلیس دانیشت، بەلام ئەوپیاوی سێیەم ، ڕۆیشت بەری ســوورِاند ، پاشــدان وەکوو لەوەعز بۆوە فەرمووی ئاگاداربن لەحالی ئەم سێ کەسە، خەبەرتان پێدە دەم، یەکیکیان گەڕاوە لای خودا ، خودا حەواندییەوە ، ئەویتریان شەرمی کرد لەپشت مەجلیس دانیشت خوداش شـــەرمی لەوکــرد ،( یەعنی مکافاتی شەرمەکەی داوە ) ،

ئەما ئەوی بەری سوورِاند ڕۆیشت خوداش ڕووی لەو وەرگێڕا ،

---

**٤٨ عن أبي بكرة ، قال عليه الصلاة والسلام ، أي يوم هذا أليس يوم النحر ، أي شهر هذا أليس بذي الحجة ثم قال فــان دمائكم ، واعــراضكم بينكم ، حرام كحرمــة يومكم هذا ، في شهركم هذا في بلدكم هــذا ليبلغ الشاهــد الغائب ، فان الشاهد عسى أن يبلغ من هو اوعى له منه ،**

( تەرجــەمە )

٤٨ دەگێڕنەوە لەئەبی بکرە ، ڕەزای خوای لێبی گوتی پێغەمبەر

سواری سەرووشتری خۆی بوو جەلەویش بەدەست یەکێکەوە بوو•فەرمووی ئیمرۆ چی ڕۆژێکە • ئێمەش قسەمان نەکرد هەتاوا گومانمان برد ناوێکی تری لێدەنێ فەرمووی ئەدی ئیمڕۆ یوم النحر نییە •

( یەعنی جێژنەی قوربان نییە ) • ووتمان هاری ( بەلێ ) فەرمووی ئەمە چی مانگێکە دەنگمان نەکرد واتێ گەیشتین ناوێکی تری لێدەنێ •

فەرمووی ئەی ئەمە ذی الحجە نیە •

ووتمان : بەلێ • فەرمووی بەموحەققەقی خوێنتان ومالتانو عەرزو ئاموستان لەبەینی خۆبەخۆیتان محترەمەو بەرێزە • وەکوو ئیحترامی ئەو ڕۆژەتان • لەم مانگەتان • لەم شارەتان • باڕابگەینی•ئەم قسەیەی من ئەوی ئامادەیە لێرە•بۆئەوکەسانەی لێرە نین • چونکی ئەوەی کەحازرە • لایقە تەبلیغ بەکەسێکی وابکا لەو ضەبط کوننده ترو زاناترە •

**٤٩ عن انس (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • قال يسروا ولا تعسروا • وبشروا ولا تنفروا •**

( تەرجەمە )

٤٩ دەگێرنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێبی فەرمووی پێغەمبەر (د) لەهەموو کاروباری خۆتان سەهلیو نەرمی نیشاندەن • سەختیو ڕەقی نیشان مەدەن لەهەموو گوفتارو کرداری خۆتان • موژدەدەرو فەرەح بەخش بن • هیچ کەسێك لەخۆتان بێزارو هەراسان مەکەن •

**٥٠ من معاوية (ض) قال سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول • من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين وانما انا قاسم والله عز وجل يعطي • ولن تزال هذه**

الامة قائمة على امر الله لا يضرهم من خـالفهم حتى يـأتي امر الله ٠

( تەرجـەمە )

٥٠ دەگێڕنەوە لەمەعاویـــە ڕەزای خودای لێ بێ گوتی بیستم پەیغەمبەری خودا دروودی خوای لەسەربێ دەی فەرموو هەرکەسێك خودا بیەوێ چاکەی لەگەل بکا ٠

مەهارەتی دەداتێ لەدین منهەر بەشکەری علومم ( بە سەبەب وەحی)٠ وە خودا کەغالبە وەگەورەیە ٠

دەبەخشی ( بەهەرکەســـێك بەومقدارەی کەئیرادەی پێ کردووە ) چۆنیەتی تێگەیاندنیش لەلایەن خواوەیە ٠ وە دائما مادام ئەم ئومەتەی من چەسپاوین لەسەر فەرمانی خودا ٠ زەرەرو زیان بەوان ناگـەینی ئـــەو کەسەی مخالفی ئەوانە ٠

---

٥١ عن عبدالله ابن مسعود (ض) قال : قال رسول الله صلى الله تعـالى عليه وسلم ٠ لا حسد الا في اثنتين ٠ رجل آتاه الله مالا ٠ فسلط على هلكتـه في الحق ٠ ورجـل آتاه الحكمة ٠ فهو يقضي بها ويعلمها ٠

( تەرجـەمە )

٥١ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود (ڕەزای خودایان لێ بێ)

گوتی پێغەمبەر فەرمووی،حەسوودی پێبردن دروست نیە لەهیچ شتێك،
لەدوو خەسڵەت نەبێ یەکیان : پیاوێك خودا مالی پێدابی لەتەرەف خوداوە
ئەمپیاوە موسەلەط کرابی کەماڵەکەی لەڕێگای حەق وە لەچاکە سەرفی بکا،
دووەم : پیاوێك زانینی قورئانی پێدرابی لەلایەن خواوە ئنجا بەحوکمی
قورئان بجوولێتەوە وەخەلقیش فێربکا ،

---

## ٥٢ عن ابن عباس (ض) ،

**عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ، قال ما بعثني الله به من الهدى والعلم كمثل الغيث الكثير اصاب ارضا فكان منها نقية قبلت الماء ، فأنبتت الكلأ والعشب الكثير ، وكانت منها اجادب امسكت الماء فنفع الله بها الناس فشربوا وسقوا وزرعوا واصاب منها طائفة اخرى انما هي قيعان لا تمسك ماء ولا تنبت كلاء فذالك مثل من فقه في دين الله ونفعه ما بعثني الله تعالى به فعلم وعلم ، ومثل من لم يرفع بذلك رأسا ولم يقبل هدى الله الذي ارسلت به ،**

( تەرجەمە )

٥٢ دەگێرنەوە لە ئەبوموسی [ ڕەزای خودای لێبی ] ، ئەویش
لە پێغەمبەر (د)،ئەوشتی کەخودا منی پێ ناردووە لەهیدایەتو عیلم ،وەکوو
بارانێکی زۆرە بکەوێتە عارد ، ئنجا هەندێ عارد هەیە پاکەو خاوێنە قبوولی
ئاو دەکا ، زۆر گیاو پووشی لێ دەڕوێ ، هەندێ پارچە عاردیش هەیە
سەختو ڕەقە ئاو ڕادەگری ، خودا بەوعاردە کەلك بەخەلك دەگەیەنی ،
ئنجا خۆیان دەخۆنەوە وە حەیواناتی لێ ئاو دەدەن ، وەکشتوکالی لەبەر

دەکەن وە هەندێ جۆرە عاردیش هەیە دەشتێکی فرەوانو زیخەڵانە • نە ئاو ڕادەگری عالەم کەڵکی لێ ببینی نەهیچ گیاش دەڕوینی خۆی بێ سوودمەندبی • ئنجا ئەمە وەکوو ئەو کەسەیە مەهارەت (شارەزایی) بووە لەدین خودا کەلکی پێ گەیاندووە بەوشتی خوداوەندی گەورە منی پێناردووە • خۆشی دەزانێو فێری خەلکیش دەکا • وە مشالی ئەو کەسەشە سەری بلند نەکردبی بۆئەو علمو هیدایەتەی کەمن پێ هاتووم لەخودای گەورەوە •

---

## ٥٣ عن انس (ض) • قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ، ان من اشراط الساعة • أن يرفع العلم ويثبت الجهل ويشرب الخمر ويظهر الزنا •

( تەرجـمەمە )

٥٣ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خوای لێبێ گوتی پێغەمبەر فەرمووی بەموحەقەقی لەنیشانەی قیامەتە ئەم چوارشتە ( یەکیان نەمانی علم دووەم دەوامو مانەوەی نەزانین سێیەم خواردنەوەی ئارەق چوارەم زینا بەئاشکرا ) •

---

## ٥٤ عن انس (ض) قال لاحدثنكم حديثا لا يحدثكم أحد بعدي سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول ان من اشراط الساعة ان يقل العلم ويظهر الجهل ويظهر الزنا وتكثر النساء ويقل الرجال حتى يكون لخمسين امرأة القيم الواحد •

( تەرجــەمە )

٥٤ دەگێڕنەوە لە ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێ • گوتی حەدیثێکی واتان بۆ بخوێنمەوە، لەپاش خۆم کەس بۆتان نەخوێنێتـــەوە • بیســـتم لە پێغەمبەری خودا (د) • دەی فەرموو بەڕاستی لەنیشانەکانی قیامەتـــە ئەم پێنج شتانە •

یەکیان کەم بوونی علومی دینیە • بەدیارکەوتنی نەزانین لەعلومی دین • سێیەم زیناى بەئاشکرایە (چوارەمی) زۆربوونی ئافرەتانە ( پێنجـــەم) کەم بوونی پیاوانە هەتا بەغایەتێك • بۆپەنجا ئافرەت • یەك پیاو • چاودێریان دەکا •

---

**٥٥ عن عمر • رضي الله عنه قال سمعت رســول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • يقول : بينا انــا نائم أتيت بقدح لبن فشربت حتى اني لارى الري يخرج في اظفاري ثم اعطيت فضلي • عمر ابن الخطاب • قالوا فما أولته يارسول الله قال العلم •**

( تەرجــەمە )

٥٥ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بێ ، ووتی بیستم لە پێغەمبەر (د) دەی فەرموو وەقتێك من لەخەودا بووم پیالــە شیرێکم پێدرا • ئنجا خواردمەوە هەتا دەمــــدیت تێراوی لەنینۆکەکانم

دەردەچوو • پاشان ئەوی کەزیادبوو لەخۆم دام بەعومەری کوڕی خطاب ئەصحاب عەرزیان کرد • چلۆنت تەعبیر لێداوە فەرمووی بە ـ عیلم •

---

## ٥٦ عن عبدالله ابن عمرو ابن عاص (ض) ان النبي صلى الله عليه وسلم قال اذبح ولا حرج ، ارم ولا حرج ، افعل ولا حرج •

( تەرجەمە )

٥٦ دەگێڕنەوە لەعبدالله‌ی کوڕی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خودای لێ‌بێ • بەڕاستی پێغەمبەر ( د ) لە حجة الوداع ڕاوەستابوو • بۆ سوودی خەڵکی پرسیاریان لێ‌دەکرد ( لەمنی ) •

ئنجا پیاوێك هاتە لای گوتی نەمزانی سەرم تاشی لەپێش کوشتنەوەی حەیوان ( یەعنی هێشتا حەیوانم نەکوشتوتەوە ) فەرمووی بچۆ بکوژەوە قەیدی ناکا •

پیاوێکی‌تر هات گوتی نەمزانی حەیوانم کوشتەوە لەپێش ڕەجمی شەیتان فەرمووی بچۆ ڕەجمی شەیتان بکە • قەی ناکا •

والحاصل هیچ سؤالێك نەکرا ئەوڕۆژە لە پێغەمبەر (د) • لە شەعائری موقەدەمەو مؤخەرە ( واتە سەرەتاو دوایی حەج ) هەر فەرمووی بچۆ بیکە • قەی ناکا •

---

## ٥٧ عن ابي هريرة (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • قال : يقبض العلم ويظهر الجهل والفتن ويكثر الهرج •

( تەرجـەمە )

٥٧ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێ ئەویش لــە پێغەمبەر (د) ٠

فەرمووی عیلم وەردەگیرێتەوە ٠ یەعنی بەمردنی زاناکان خودا عیلم دەباتەوە لای خۆی ٠وە نەزانین و فتنە بەدیاردەکەوی ٠ وە هــەرەج زۆر دەبی ٠ گوتیان یا رسول الله هەرەج چییە فەرمووی ئاوایە دەستی مبارەکی وەرگێڕاو جوولاندەوە ڕاوی (واتە ئەوەی دەگێڕێتەوە ) ٠ دەلێ پێغەمبــەر مەبەستی پێ کوشتن بووە ٠ یەعنی کوشتن زۆر دەبی ٠

---

**٥٨ عن اسماء بنت ابي بكر رضي الله تعــالى عنهما قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ ما من شيء لم اكن اريته الا رأيته في مقامي هذا ٠ حتى الجنة والنار ٠ فاوحي الي انكم تفتنون في قبوركم مثل أو قريبا من فتنة المســيح الدجال ٠ يقال ما علمك بهذا الرجل ٠ فاما المؤمن او الموقن فيقول هو محمد هو رسول الله جاءنا بالبينــات والهدى ٠ فأجبناه واتبعناه هو محمد ثلاثا فيقال نم صالحا قد علمنا ان كنت لموقنا به واما المنافق والمرتاب فيقول لاادري سمعت الناس يقولون شيئا فقلته ٠**

( تەرجـەمە )

٥٨ لە ئەسمائەی کچی ابو بکری صــدیق دەگێڕنــەوە ڕەزای خودایان لێبێ ٠ گوتی هاتمە لای عائشەی خوشکم دایکی ئیمانداران نوێژی

دەکرد گوتم بۆچی عالەم هاوار دەکەن و مشەوەشن ئیشارەی بۆئاسـمان کرد مەعنا ڕۆژ گیراوە هەندێ کەسیش نوێژی ڕۆژ گیرانیان دەکرد •

عائشە فەرمووی سبحان اللە • گوتم ئەمە عەلامەتە بەسـەر ئیشارەی فەرموو ( نعم ) واتە بەلێ منیش هەلستام نزیك بوو لەهۆش بچم • خـەریك بووم ئاوم بەسەری خۆمدا • دەکرد •

پێغەمبەر (د) • حەمدو ئەنای خودای کرد پاشان فەرمووی • هیـچ شتێکی کەلەمە پێش نیشانم نەدرابێ مەگەر نیشانمدرا لـەم جێگایەی خۆم ئەمە • هەتا بەغایەتێك بەهەشتو ئاگریشم نیشاندرا • ئنجا وحیم بۆکـرا کەبەڕاستی ئێوە سؤالتان لێدەکرێ لەناو قەبرەکانتان وە تووشی بەلاّ دەبن• وەکو : یاخۆ نزیك لەبەلاّی مەسیحی دەجال•سؤالتان لێدەکرێ مەعلوماتتان چی هەیە دەرحەق بەم پیـاوە ئنجـا ئەمەی ئیماندار بێ • یاخۆ فـەرمووی ئەهلی یەقین بێ • دەلێ ئەمە محمـدە • ئەمە نـاردراوی خودایە بۆ ئێمە هات بەدەلیلی ئاشکراو بەهیدایەت • ئێمەش جوابمان داوە وە تـابعی بووین • ئەمە محمدە سێجار • ئنجا پێی دەگوترێ بخەوە بەبێ عەزابـو بـەخۆشی بەڕاستی زانیمان بەتەحقیق تۆ ئەهلی یەقینی • وە ئەما ئەوەی منـافق بێ • یاخۆ فەرمووی ئەوەی لەشکدابێ ( لەجوابی مەلائکـە دەلێ نـازانم ) • دەمبیست خەلکی شتەکیان دەگوت منیش دەمگوت •

---

## ٥٩ عن عقبة ابن حارث (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • كيف وقد قيل •

( تەرجـمەمە )

٥٩ دەگێڕنەوە لەعەقەبەی کوڕی حـارث ڕەزای خودای لێبێ •

کەکچی ئەبوو ئەهابی کوڕی عەزیزی مارەکرد • ئافرەتێك هــاتەلای گوتی
منشیرم بەئافرەتەکەی داوە • عەقەبەش گوتی نازانم شیرت بەمن دابی • وە
خەبەریشت بەمن نەداوە سواربوو بۆمەدینە چوو بۆخدمەت پێغەمبەر ( د )
لەخصوص قسەی ئافرەتەکە • سؤالی لێکرد • فەرمووی چلۆن • بە تەحقیق
گۆترا • گوتی با ئافرەتەکەش قسەی اعتبار نەکرێ بەلام لەئــەهلی مــروەت
ناوەشێتەوە پێی بگوترێ خوشکی رضاعی خۆی مارەکردووە • ئنجا عەقەبە
دەستی لەئافرەتەکە کردەوە •

( ئەمە؛ حوکم نیە بەثبوتی شیر چونکی تەنیا بە قسەی شــیردەر حوکم
بەثبوتی شیر ناکرێ لای ئیمامی احمد نەبێ کەتەنیا بەقسەی مرضعە اثبــات
دەکا ) ( چونکی حوکمی بەظاهری حەدیث کردووە ) •

---

## ٦٠ عن عمر رضي الله عنــه • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم لا : لما سأله اطلقت نساءك يا رســول الله حين أعتزلهن شهرا •

**( تەرجــەمە )**

٦٠ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومەر ( ڕەزای خوای لێبی ) گوتی
پسیارم کرد لەپێغەمبەر (د) ئەرێ تۆ ئافرەتەکانی خۆت تەلاقداوە•فەرمووی
نا • هوێ پسیارەکەیشە هەروەکوو لەسوورەی تەحریم دیاری کــردووە •
ئافرەتەکان دلیــان موکەدەر کردبوو ( دلیــان شــکاندبوو ) • یــەك مانگ
نزیکیان نەکەوت •

---

## ٦١ عن ابن مسعود الانصاري قال النبي صلى الله

**تعالى عليه وسلم . يا ايها النـاس انكم منفرون فمن صلى بالناس فليخفف فان فيهم المريض والضعيف وذا الحاجة .**

( تەرجـەمە )

٦١ دەگێڕنەوە . لە ئەبوو مەسعوود (ض) گوتی پیاوێك عەرزی پێغەمبەر كرد (د) . فەرمووی نزیك نی‌یە بگەمە نوێژ چونكی فلان نوێژێكی درێژمان پێ‌دەكا . ئنجا نەمدی لەهیچ وەعزێك پێغەمبەر (د) ئەمەندەی ڕق بێتەوە ئنجا فەرمووی ئەی خەلكینە . ئێوە خەلكی‌دەڕەوێننەوە . هـەر كەسێك ئیمامەتی دەكا . باسووكی بكا . چونكی پیاوهەیە ناساغە . پیـاو هەیە بێ‌تاقەتە . پیاو هەیە ئیشوكاری هەیە .

---

**٦٢ عن زيـد ابن خالد الجهني (ض) ان النبي صلى الله عليه وسلم سئله رجل عن اللقطة . فقال اعرف وكاءها او قال وعائها وعفاصها . ثم عرفها سنة ثم استـمتع فان جاء ربها فادها اليه . قال فضـالة الابـل . فغضب حتى احمرت وجنتاه . او قال احمر وجهه فقال ما لك ولها معهـا سقائها وحذاءها ترد الماء وترعى الشجر . فذرهـا حتى يلقاها ربها . قال فضـالة الغنم . قـال لك او لاخيك او للذئب .**

( تەرجـەمە )

٦٢ دەگێڕنەوە . لەزەیدی كوڕی خالدی جوهنی ، پیاوێك پسیاری كرد لەپێغەمبەر (د) لە شتێك خاوەنەكەی لێی كەوتبی هەلگیرابێتەوە چی لێ‌بكەین . فەرمووی دەرك بەستی یازەرفەكەی . بناسە پاشـان تەعریفی

شته‌که بکه • ( له‌و جێگایانه که‌شکی خاوه‌نه‌که‌ی لێ ده‌کرێ ) • ســــالێك پاشدان ئه‌گه‌ر خاوه‌نی په‌یدا نه‌بوو • به‌کاری بینه • ئه‌گه‌ر خاوه‌نیشی په‌یدا بوو بیده‌وه •

پیاوه‌که ووتی ئه‌دی ووشتری بزربوو حوکمی چی‌یه؟ پێغه‌مبه‌ر رقی بۆوه هه‌تا هه‌ردوو کولمه‌ی سوور داگه‌را فه‌رمووی تۆچیت به‌سه‌ر ووشتره‌وه هه‌یه راوه‌ی خۆی پێ‌یه که‌وور گی‌یه‌تی پڕی ئاوی ده‌کا تایه‌کدوو رۆژ ئیداره‌ی پێ ده‌کا •

پێلاویشی پێ‌یه • که‌پیسته‌ی بنی پێ‌یه‌تی • بۆخۆی ده‌چێته ســـه‌رئاو • وه‌له‌ دارو دره‌ختانیش ده‌له‌وه‌رێ وازی لێ‌بێنه هه‌تا خاوه‌نه‌که‌ی تووشی دێ •

پیاوه‌که ووتی ئه‌دی حوکمی مه‌ڕی بزربووی چی‌یه فه‌رمووی بۆتۆیه یاخۆ بۆبراته ( یه‌عنی غه‌یری تۆ یه‌کێکی‌تر ده‌یدۆزێته‌وه• ) یاخۆ بۆگورگ •

تووڕه بوونی پێغه‌مبه‌ر (د) له‌به‌ر خراپ تێ‌گه‌یشتنی پیـــاوه‌که‌بوو• چونکی قیاسی ووشتری بزربووی کرد له‌سه‌ر غه‌یر نه‌ظیر ( یه‌عنی فه‌رقی هه‌یه له‌به‌ینی شتی‌بزربوو هه‌لگیرایه‌وه ) • فه‌رقیشی‌کرد له‌به‌ینی مه‌ڕوو ووشـــتر چونکی مه‌ڕ جێگای ترسه له‌گورگ بۆپیاوه‌که هه‌یه بیبا • به‌لام ووشـــتر جێی ترس نی‌یه له‌درنده که‌س حه‌قی نی‌یه بیبا •

---

**٦٣ عن ابي موسى (ض) قال سئل النبي صلى الله تعالى عليه وسلم عن اشياء كرهها• فلما اكثر عليه غضب• ثم قال سلوني عما شئتم • قال رجل من ابي •**

**قال أبوك حذافة • فقام آخر فقال من ابي يا رسول الله قال سالم مولى شيبة • فاما رءى عمر ما في وجهه قال يـــا**

**رسول الله انا نتوب الى الله عز وجل ٠**

( تەرجـــمەه )

٦٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو موسی ڕەزای خوای لێبی گوتی سؤالێکی بێ فائدە لەغەیری اموری دین کرا لە پێغەمبەر (د) ٠ پێی ناخۆش بوو ٠

پاشان وەکوو زۆریان ئەم نەوعە سؤالانەیان لێ کـــرد ڕقی بۆوە ٠ پاشان فەرمووی لەهەرچی حەز دەکەن لێم بپرسن ٠ پیاوێك گوتی باوکی من کێیە ؟

فەرمووی باوکت حوذافەیە ٠ پیاوێکی تر هەلسا گوتی باوکی من کێیە ٠ ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی سالمە عەبدی شەیبەیە ٠

پاشان حەزرەتی عومەر لەڕوویی مباردکی دەرکی ڕك بوونەوەی دەکرد ٠ گوتی ئێمە بەرامبەر ئەم قسانە رجوع ئەبینـــەوە بۆلای خودا کەغالبـــەو گەورەیە ٠

---

**٦٤ عن أبي موسى قال رسول الله (ص) ثلاثـــة لهم اجران ٠ رجل من اهل الكتاب آمن بنبيه وآمن بمحمد(ص) والعبد المملوك اذا أدى حق الله تعالى وحق مواليه ٠ ورجل كانت عنده امة يطئها فادبها فاحسن تاديبها وعلمها فاحسن تعليمها ثم اعتقها فله اجران**

( تەرجـــمەه )

٦٤ دەگێڕنەوە لەئەبوو موسی ( لەنوسخەیەکی‌تر لەئــــەبو بوردە گێڕایتی‌یەوە لەباوکی خۆی ٠ ) گوتی پێغەمبەری خودا (د) ســـێ پیـــاوهەن

هەریەك لەوان دوو ئەجرو ئەواییان هەیە ٠ پیاوێك لەئەهلی كتاب بێ ئیمانی بە پێغەمبەری خۆی هینابێ٠باوەڕیشی بە محمد(د)هینابێ٠پیاوێكیش بەندەی مەملووك بێ حەقی خودای بەجێ گەیاندبێ ٠ وە حەقی گەورەكانی خۆشی بەجێ گەیاندبێ ٠ پیاوێكیش جاریەكی لابێ ـ جماعی لەگەڵ بكا ـ واتـــە لەگەڵی جووت بێ ٠

پاشان زۆر باش فێری ئادابی بكا ٠ وە زۆر بەشیش فێری كـاروباری ئایینی بكا ٠ پاشدان ئازادی بكا ئنجا لەبۆ ئەو هەیە دوو پاداشتو ئەواب٠

( دووبارە كردنەوە دوو پاداشت لەپیاوی سێیەم لەبەر ئیشارەیە وەبال ئەمە كەلەبەر ئەوەیە جاریەكە بەرەللاو ئازاد دەكاو یـان لەخۆی مارە دەكـا چونكی فێر كردنو رەووشـت پێدان پێویستی كرینـە بەگوێرەی بێگانـە تایبەتی نییە بەجاریە ) ٠

---

**٦٥ عن ابي هريرة (ض) قال قلت يا رسول الله من أسعد الناس بشفاعتك يوم القيامة فقال رسـول الله صلى الله عليه وسلم ٠ لقد ظننت يا أبـا هريرة ان لا يسئلني عن هذا الحديث احد اول منك لما رأيت من حرصك عن الحديث ٠ أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قـال لا اله الا الله خالصا من قلبه أو نفسه ٠**

**( تەرجـەمە )**

٦٥ دەگێرنەوە لەئـەبوو هورەیـرە ڕەزای خودای لێبی گوتی ئەرزی پێغەمبەرم كرد ڕۆژی قیامەت كێ لە هەموو كـەس بەسـەعادەت ترە

بەتکای تۆ • پێغەمبەر (د) فەرمووی بەموحەققەقی ئەی ئەبوو هورەیرە • وە بێ گومان یەقینم کرد هیچ کەسێك لەپێش تۆ لەم حەدیثە لەمن ناپرسی چونکی اشتیاق‌و ڕشتی تۆ دەزانم چەند زۆرە لەسەر حەدیث • بەســـەعادەت ترینی خەلکی بە شەفاعەتی من ڕۆژی قیامەت ئەوکەسەیە گوتبیتی لا اله الا الله بـە دلێکی بێ‌گەرد بەدلسۆزی دوور لە شیرکو ڕیا ( واتــە خوابەیەك‌نەزانین‌و ڕیاکاری ) • یاخۆ فەرمووی بەخلوصی ڕوحی‌و نەفسی •

---

**٦٦ عن عبدالله عمر ابن العاص (ض) قال سـمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول ان الله لايقبض العلم انتزاعا ينتزعه عن العبـاد • ولكن يقبض العلم بقبض العلماء • حتى اذا لم يبق عالما • اتخذ رؤساء جهالا فسئلوا • فأفتدا بغير علم فضلوا واضلوا •**

**( تەرجـــمەە )**

٦٦ دەگێرنەوە لەعبـــدالله‌ی کوڕی عەمری کوڕی عاص • ڕەزای خودایان لێ‌بێ گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د)دەی فەرموو بەتەحقیق خودا علم لەناردهەل‌ناگری • بەداڕنینی لەسینەی مەلایان •

لە بەندەکانی خۆی بەلکی عیام دەبانەوە لای خۆی بەبردنەوەی مەلایان بۆلای خۆی • هەتا وای لێ‌دێ یەك عالم نامێنێ • خەلــکیش ســـەرۆکە نەزانەکانیان بەزانینی دین هەل‌دەبژێرن بۆ کاروباری خۆیان • ئنجا پرسیاریان لێ‌دەکرێ لەدین فتوای دەدەن بەبێ زانین • ئنجا خۆیان بزرن لەڕێگای ڕاست ڕێگاش بەخەلکی بزر دەکەن •

---

٦٧ عن ابي سعيد الخدري (ض) قال قالت النساء للنبي (ص) غلبنا عليك الرجال فاجعل لنا يومـا من نفسك فوعدهن يوما لقيهن فيه فوعظهن وأمرهن فكان فيما قال لهن . ما منكن امرأة تقدم ثلاثة من ولدها الا كان لها حجاب من النـار فقـالت امرأة منهن . واثنين قال واثنين . وفي رواية عن ابي هريرة (ض) لم يبلغوا .

( تەرجـەمە )

٦٧ دەگێڕنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری گوتی ئافرەتان عەرزی پێغەمبەریان کرد (د) بۆ بەخدمەت گەیشتنی تۆ . پیاو لەسەر ئێمە غالبن. لەخۆتەوە ڕۆژێکمان بۆ تەخصیص ــ بفەرموو ئنجا ڕۆژێکی پێدان کـەلەو ڕۆژە بەخدمەتی بگەن . ئنجا وەعزی بۆدان چەند ئەمری پێ کردن . یـەك لەفەرموودەکانی کەبە ئافرەتەکانی گۆت ئەمەبوو . فەرمووی. هەرئافرەتێك لەئێوە . ڕەوان بکا سێ مندالی خۆی لەپێش خۆی بۆ آخرەت بەبێ شـك بۆی دەبێتە مانع لەئاگر پاشان ئافرەتێك گوتی ئەگەر دووشبێ . فەرمووی ئەگەر دووشبێ لەریوایەتی ئەبوهورەیرە دەلێ ــ باوغیان نەبووبێ .

---

٦٨ عن عائشة رضي الله تعالى عنها ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال : من حوسب عذب . قالت عائشة فقلت اوليس يقول الله عز وجل فسوف يحاسـب حسابا يسيرا فقال انما ذلك العرض . ولـكن من نوقش الحساب يهلك .

( تەرجـەمە )

٦٨ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بێ بێ گومان پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێك حسابی لەگەل بکرێ • عەزاب دەدرێ عائشە فەرمووی عەرزم کرد ئەدی خودا نەی فەرمووە • ئەوی ئیمانداربێ ەپاشدان حسابێکی کەمی لەگەڵ دەکرێ وە داخلی قۆنـاغی خۆی دەبێ ەبەهەشت فەرمووی ئەم حسابی کەم دەرحەق بە ئیمانداران حساب نی‌یە • بەلکی هەرنیشان ــ دانی دەفتەری کردەوەیتی • بەلام ئەوەی بەمناقەشەو حراپە لێ گرتن حسابی لەگەڵ بکرێ بەهیلاکدەچێ •

---

**٦٩ عن أبي شريح قال رسول الله (ص) ان مكة حرمها الله ولم يحرمها الناس فلا يحل لامرء يؤمن بالله واليوم الاخر ان يسفك بها دما ولا يعضد بها شجرة فان احدترخص لقتال رسول الله (ص) فيها فقولوا ان الله تعالى قد اذن لرسوله ولم ياذن لكم • وانما اذن لي ساعة من نهار ثم عادت حرمتها اليوم كحرمتها بالامس وليبلغ الشاهد الغائب •**

( تەرجـەمە )

٦٩ دەگێڕنەوە لەئەبی شورەیح پێغەمبەر (د) فەرمووی بەتەحقیق حەرەمی مەکە خوا گێڕایتی بەموحتەرەم وانی‌یە لەلایەن خەلکی‌بێ ئیحترامی مەکە • ئنجا ئەگەر کەسێك کوشتاری پێغەمبەر بکاتە دەلیل بۆ روخصەتی کوشتار لەمەکە • پێی بلێن خودای گەورە پێغەمبەری خۆی ایزندا ئێوەی ئیزن نەدا بۆمنیش تەنیا یەك ساعە تلەیەك ڕۆژ ئیزنی پێ بوو پاشدان ئیمرۆ

حورمەتەکەی گەڕایەوە • وەکوو ئیحترامی دوێنێکەی ( یەعنی ئێستا وەکوو زەمانی قەدیم هەرلەسەر ئیحترامی خۆینی ) • وەبا تەبایعیش بکەن ئەوانی مەوجودن لێرە بەوانی کە لێرە نین •

---

**٧٠ عن علي رضي الله عنه • قال سمعت رسول الله (ص) يقول لا تكذبوا علي فانه من كذب علي فليبوء مقعده في النار •**

( تەرجەمە )

٧٠ لە حەزرەتی عەلی دەگێڕنەوە ڕەزای خودای لێ بی • گوتی بیستم لەپێغەمبەر(د)دەی فەرموو درۆ بەزمانی منمەکەن•چونکی هەرکەسێك ددرۆ بەزمانی من بکا با جێگای خۆی سازدا لەئاگر •

---

**٧١ عن سلمة ابن الاكوع • قال سمعت رسول الله (ص) يقول من يقل علي ما لم أقل • فليتبوء مقعده في النار •**

( تەرجەمە )

٧١ دەگێڕنەوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خوای لێ بی • گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) • دەی فەرموو هەرکەسێك بەزمانی من قسەیەك بلێ من ئەم گوتبی باجێگای خۆی سازبدا لەئاگر •

---

**٧٢ عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه عن النبي (ص) انه قال : تسموا بأسمي ولا تكنوا بكنيتي • ومن رآني**

في المنام • ففد رآني • فان الشيطان لا يتمثل في صورتي • ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده في النار •

( تەرجـەمە )

٧٢ دەگێرنەوە لەئەبووهورەیرە • رەزای خودای لێبی • بەڕاستی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربی گوتی • ئاو لەمندالتان بنێن محمد بەلام کونیەی من مەگێڕن بەکونیەی کەسێك ( بەکەسێك مەلێن ابو القاسم ) •

وە هەرکەسێکیش من لەخەودا ببینی بەڕاستی ئەوا منی دیت • چونکی شەیتان ناتوانێ بێتە سەر شکلی من • وە هەر کەسێکیش عەمـدا درۆیەك بەزاری مندا بکا • باجێگای خۆی سازبدا لەئاگر •

---

٧٣ عن ابي هريرة رضي الله عنه ان النبي (ص) قال إن الله حبس عن مكـة الفيل او القتل وسـلط عليهم رسول الله والمؤمنون الا وانها لم تحل لاحـد قبلي ولا تحل لاحد بعدي او انها احلت لي ساعة من نهار الا انها سـاعتي هذه حرام • لا يختلى شوكها • ولا يعضد شـجرها • ولا تلتقط ساقطها • الا لمنشد ، فمن قتل له قتيل فهو بخـير النظرين اما ان يفعل واما ان يقاد أهل القتيل فجاء رجل عن أهل اليمن • فقال اكتب لي يا رسول الله فقال اكتبوا لابي فلان • فقال رجل من قريش الا الاذخر • يا رسول الله فانا نجعله في بيوتنا وقبورنا • فقال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم الا الاذخر •

( تەرجـەمە )

٧٣ دەگێڕنەوە لەئەبووهوریرە ـ ڕەزای خودای لێبێ ـ کـــە بەڕاستی پێغەمبەر (د) لە خوتبەیەك گوتی بەڕاستی خودا مەنعی کرد لەمەکەی پیرۆز ـ فیل ـ یاخۆ فەرمووی خودا ئەو فیلانەی کوشت • وە موسەلەط کرا لەسەر مەکە پێغەمبەری خوداو ئیماندار • ئاگاداربە حەلال نەبووە بۆ یەکێك ( مەکە ) لەپێش من حەلالیش نابی بۆ یەکێك لە پاش من • ئاگاداربە بۆمنیش سەعاتێك لەڕۆژێکدا بۆمن حەلال کرا وە ئاگاداربە ئەم سەعاتەی من ئێستا • لانابردرێ درکو دالی• وە داریش نابڕدرێ شتی کەوتووی هەل ناگیرێتەوە• مەگەر بۆکەسێك نەبێ بانگ ڕابێلی • پاشان ئەگەر کەســـێك یەکێکی لێ بکوژرێ •حەواله دەکرێ بەباشترینی دوو ڕێگا • یاخۆ دەبی مالی پێ بدرێ• لەلایەن خزمو کەسی قاتل ـ واتەکوژەر ـ یاخۆ تەسلیمی خـاوەن کوژراو دەکرێ بۆ ( قصاص ) واتە تۆلەسەندنەوە • پاشان پیاوێکی ئەهلی یەمەن هات گوتی ئەم خوطبەیە بۆمن بنووسە ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی بنووســن بۆفلان عەشیرەت پاشدان یەکێك لەئەهلیمەکە گوتی ـ ئەذخەر ـ نـەبێ ( کەئەذخەریش گیایەکی بێن خۆشە ) چونکی ئێمە ئەیخەینە خانووەکانمان وە قەبران پێ دادەپۆشین ـ فەرمووی ئەذخەر نەبێ •

---

**٧٤ عن ابن عباس ( رض ) قال لمـا اشـتد بالنبي وجعه قال أتوني بكتاب اكتب لكم لا تضلوا بعده • فقال عمر ان النبي (ص) غلبه الوجع وعندنا كتاب الله تعالى حسبنا • وجعه قال اتوني بكتاب اكتب لكم لا تضلوا بعده • فقال عمر التنازع •**

( تەرجـەمە )

٧٤ دەگێرنەوە لەکوڕی عەباس رەزای خودای لێبی گوتی وەکوو پێغەمبەر (د) نەساغیەکەی لەسەری گران بوو • فەرمووی قاقەزێکم بۆبینن • قاقەزێکتان بۆدەنووسم • رێگابزر ناکەن لەپاش ئەم قاقەزە • پاشان حەزرەتی عومەر فەرمووی نەساغیەکەی پێغەمبەر (د) بەئازارە • ئێمەش قورئانمان لایە • بەسە بۆ ئێمە • پاشان لەخصوصی نووسینی مەکتووب لەبەینی ئەصحاب اختلاف پەیدابوو • دەنگە دەنگ زۆر بوو • فەرمووی لای من هەلستن لایق نیە نزاع ( واتەدووبەرەکی ) لەلای من •

---

**٧٥ عن ام سلمة (ض) قالت استيقظ النبي ( ص ) ذات ليلة فقال سبحان الله ماذا أنزل الليلة من الفتن وماذا فتح من الخزائن • ايقظوا صواحب الحجر فرب كاسية في الدنيا عارية في الاخرة •**

( تەرجـەمە )

٧٥ دەگێرنەوە لە ام سلمە ــ رەزای خودای لێبی گوتی شەوێك پێغەمبەر (د) بەخەبەرهات فەرمووی پاکی لەعەیبو نەقص (کەمی)بۆخودایە• ئیمشەو چی فتنەو مصیبەت ناردرانە خوارێ بە خەبەر بینن ئافرەتەکانم • هەریەکێك لەژوورێکی تایبەتین • زۆر ئافرەت لەدونیا هەیە جلکی جوانو نایابیان لەبەردایە رووتیشە لە ئاخیرەت •

---

**٧٦ عن عبدالله ابن عمر رضي الله تعالى عنهما قال:**

**صلى بنا رسول الله (ص) العشاء في آخر حياته . فلما سلم قال فقال أرأيتكم ليلتكم هذه فان على رأس مـأة منهـا لا يبقى ممن هو على ظهر الارض احد .**

**( تەرجـەمە )**

٧٦ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی . گوتی پێغەمبەر (د) نوێژی عیشای بەئێمەکرد لە ئاخری ژیانی. پاشان وەکوو سەلامی دایەوە هەلسا فەرمووی پێم بلێن ایشەوەی خۆتان ( یـەعنی خەبەری خۆتانم پێ بلێن . ئەرێ دەزانن چی پەیادەبی لە اموری عەجیبـە ( واتە چەشنێکی سەیر ڕوودەدا ) چونکی لەم شەوەوە هەتا سـەد سـال نامێنێ هەرکەسی لە سەرپشتی عاردە یەکێك . ( یەعنی لەوانی کـە ئێوە دەی بینن . کەوایە ئەوکەسەی استدلال بەم حەدیثە دەکا لەسەر نەمانی حـەزرەتی خدر سەلامی خوای لێ بی زەعیفە .

چونکی مەبەست لەم حەدیثە تەسلیەی دڵی ئەصحـاب بووە.چونکی غالبا زانیتی نزیك بووە وەفاتی خۆی . یەعنی ئەی ئەصحـاب بـە وەفاتو مردنی من زێك مەچوون .

لەوڕا نەمن دەمینم نەئێوە دەمینن . ئەگەرنا لەم حەدیثە هیچ کەلکێکی دینی تیانیبە . بلێن مراد ( مەبەست )ێکی تری هەبووە .

---

**٧٧ عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه قال حفظت من النبي صلى الله تعالى عليه وسلم . وعائين فاما احدهما فبثثته . واما الاخر فلو بثثته قطع هذا البلعوم .**

( تەرجـمەمە )

٧٧ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ گوتی لـە پێغەمبەر دوو زانینم وەرگرت • ئنجا یەکیکیانم بلاوکردەوە ــ وەکوو عیلمی شەریعەت و ئەحکامی دیارە • وە ئەما ئەویتریان ئەگـەر بلاوم بکردبایەوە گەرووم دەبڕا و بەهیلاك دەچووم • ( ئەمەش وەکوو عیلمی وحدة الوجود • وە عیلمی تایبەت بە ئەهلی عیرفانە • لە ئەسرار و زانینەکانی خودایی • کە چەند لەزانا گەورەکانی پێشوو پاشوو سەریان تیا سوڕماوە •

چونکی خودای گەورە بەشی غەیری خۆی نەداوە • بۆیە پێغەمبەر (د) فەرموویەتی ( ذنب الوجود ذنب لا یقاس بذنب آخر ) • ئەو گوناهی لەهەموو گوناهێك گەورەتربێ گوناهی وجوودە • چونکی شرکە •

وەکوو غەیری خوداش ــ عز وجل ــ بوو بەمەعدوم • لەمقامی مشاهدەو حضور • ئینسان خۆی نامینێ • لەبەر انحصاری وجود لەخودای گەورە • چەجای نشری علومی •

ئنجا مەبەست لە ( قەطعی بەلعوم ــ واتە گەروو دڕان ) • ئەم مەحوەیە، تەماشاکە • موسی پێغەمبەر علیه السلام • گوتی (آرنی انظر الیك) واتـــە حۆتم پیشاندە هەتا تەماشات بکەم • وەلامی بە ( لن ترانی ) واتە نـام بینی درایەوە چونکی لەمەقامی حضور غەیریەت و اثینینەت واتە غــەیری خوداو یاخودا لەگەل یەکیکیتر نابێ • باس کردنی ( وعاءین ) لەجیـــاتی علمـین مەجازێکی مورسەلە • ذکری مەحەلە مرادی پێ حالە • یا ذکری ظەرفە مورادی پێ مەظروفە چونکی حفظ بۆعیلمە بۆمەحەل نییە •

بەلام ئەگــەر وحــدة الوجودە تەفصیلاتت دەوێ لەبەرگی سێیەم

تەماشای حەدیثی ژمارە (١٣٤٦) بکە : باش حالی دەبی •

---

**٧٨ عن جرير ابن عبدالله رضي الله تعالى عنه ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال له في حجة الوداع استنصت الناس • فقال لا ترجعوا بعدي كفارا • يضرب بعضكم رقاب بعض •**

( تەرجەمە )

٧٨ دەگێڕنەوە لەجەریری کوڕی عبدالله ( ڕەزای خودای لێ بی )• بەڕاستی پێغەمبەر (د) پێی گوت لە حەجەتوالوداع • کەحەجی ئەخیری بوو• بەعالەم بلێ بێدەنگ بن • ئنجا وەعزیدا فەرمووی لەپاش من ئەگەڕێنەوە بۆ کفر •هەندێکتان لەملی هەندێکتان بدەن ( یەعنی کوشتاری یەکتریتان مەکەن ) کەعادەتێکی کافرانە •

---

**٧٩ عن ابي موسى (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله عز وجل •**

( تەرجەمە )

٧٩ دەگێڕنەوە لەئەبوو موسی (ڕەزای خودای لێ بێ)•هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی کوشتار لەڕێی خودا چیە • چونکی هەیە لەئێمە لەڕقان کوشتار دەکا • هەمیشە بۆ پاراستنی مالو وەطەنو ناموسە • پێغەمبەریش فەرمووی هەرکەس کوشتار بکا بۆ سەر کەوتنی کلمەی خودا

کە ئەمرونەهی‌یە . ( واتە فەرمان کردنە بەچاکەو نەهی کردنە لەخراپە ) .
کوشتارەکەی لەرێی خودایە . ئەویتر جهاد نی‌یە .

---

**٨٠ عن أنس رضي الله تعالى عنه . قال كان معاذ رديف رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . على الرحل فقال يا معاذ قال لبيك يا رسول الله وسعديك ثلاثا . قال ما من احد يشهد ان لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله صدقا من قلبه الا حرمه الله على النار . قال يا رسول الله افلا أخبر به الناس فيستبشرون . قال اذاً تبكلوا .**
**واخبر به معاذ عند موته تأثما .**

**( تەرجەمە )**

٨٠ دەگێرنەوە لەئەنەس رەزای خودای لێ‌بێ گوتی مەعاذی کوری جەبەل . لەدوای پێغەمبەر لەسەر ووشترێك سوار ببوون . ئنجا فەرمووی ئەی مەعاذ گوتی لەبەیکە ( واتە لەخدمەت راوەستاوم ) . ئەی پێغەمبەری خودا .

سێ جار بەم نەوعە . پێغەمبەر بانگی کرد مەعاذیش وای جواب دایەوە.

فەرمووی نی‌یە هیچ یەکێك شاهیدی بدا کەهیچ مەعبوودی بەراستی نی‌یە خودا نەبێ وە بەراستیش محمد پێغەمبەری خودایە . چلۆنێك بەزمان دەلێ لەناو دلی خۆشی راستبێ . مەگەر بەبێ شك خودا ئەوی حەرام دەکا لەئاگر .

مەعاذ گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەم موژدەیە بەخەلکی نەلێم، هەتا کەیف خۆشبن • فەرمووی ئەگەر ئەمە بەخەلق بلێی اعتماد دەکەن لەسەر مجرەدی شەهادەت هینان • واز لەطاعەتی تر دەینن مەعاذیش قسەی نەکرد بۆکەسێك هەتا نزیکی وەفاتی • ئەو وەقتە لەترسی گوناهکار بوونی خۆی بەکەتم کردنی شتێك خودا ئەمری لەسەر تەبلیغە قسەی بۆعالەم‌کرد •

---

## ٨١ عن أم سلمه • قالت قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم اذا رأت الماء • نعم تربت يمينك فبم يشبهها ولدها •

( تەرجەمە )

٨١ دەگێڕنەوە لە ( ام سلمه ) ڕەزای خودای لێ‌بێ ووتی • ووتی ام سلیم • ( ڕەزای خودای لێ‌بێ ) هاتە خەمەت پێغەمبەر (د) گوتی ( ان الله لا يستحي من الحق ) واتە خودا شەرم لەڕاستی ناکا •

وە تەرکی بەیانی حەق ناکا • منیش امتناع ناکەم لەپرسینی شتێکی وا کەلە حضور پیاوان شەرمی تیاهەبێ • ئایا غوسل ( خۆشوشتن ) لەسەر ئافرەتان هەیە ئەگەر احتلامیان ببێ پێغەمبەر فەرمووی ( ئەگەر ئاو ببینی) دایکی ئیمانداران ام سلمە ڕووی خۆی داپۆش • ووتی یا رسول الله ئافرەتیش احتلامی دەبێ فەرمووی ( نەعەم ) واتە بەلێ • دەستت فەقیربێ ئەدی چلۆن منداڵ بەدایکی دەچێ • یەعنی مشابەهەی لەگەڵی دەبێ •

---

## ٨٢ عن علي رضي الله تعالى عنه • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • فيه الوضوء عندما سئل عن المذي •

( تەرجـەمە )

٨٢ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ ) گوتی من زۆر[1] ( مذ )یم دەهاتەوە بەمقـــدادم گوت بۆم لەپێغەمبـــەر بپرســی حوكمی چی یە • سۆالی لێ كرد گوتی دەبێ دەست نوێژ بشواتەوە •

---

**٨٣ عن ابن عمر رضي الله تعالى عنهما •**

**قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم •**

**لا يلبس القميص • ولا العمامـــة ولا السـراويل ولا البرنس • ولا ثوبا مسه الورس أو الزعفران فان لم يجـد النعلين فليلبس الخفـين • وليقطعهمـا حتى تكونـا تحت الكعبين •**

( تەرجـەمە )

٨٣ دەگێڕنەوە لەكوڕی ئیمـامی عمر ـ ڕەزای خودای لێ بێ • پیاوێك سۆالی كرد لەپێغـەمبەر (د) ئەوی لەاحرام بێ • چی لەبـەر بكـا • فەرمووی كراس و مێزەرو دەرپێ و كلاو كەدورابن نابێ لەبەربكا • جلـكی ڕەنگ كراو بە وورس كەگیایەكە شت زەرد دەكا • یاخۆ بەزەعفران لەبەربكا پاشان ( دوومەحس)[1] لەپێ بكا ـ ساقەكانیشی ببڕی هەتا خوار قاچەكانی •

---

١ ـ مذی تەڕاتی یەكە نە قامیش پیاو دێتـــە دەرێ بەشە هوەت دەچێ بەلام شەهوەت ( تۆ ) نی یە •

١ ـ مەحس ( جزمەیەكە لەپێست دروست كراوە ) •

# كتـــاب الوضوء

## باسی دەســتنوێژ

**٨٤ عن ابي هريرة (ض) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . لا تقبل صلاة من احدث حتى يتوضأ .**

( تەرجــەمە )

٨٤ دەگێڕنەوە لەئــــەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێبی گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) کەسێك بێدەست نوێژ بوو هەتا دەست نوێژ نەشوا نوێژەکەی قبوول ناکرێ . یەعنی نوێژەکەی نوێژ نییە .

---

**٨٥ وعنه رضي الله تعالى عنه . قال سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول ان امتي يــدعون يوم القيامة غرا محجلين من آثار الوضوء . فمن استطاع منكم ان يطيل غرته فليفعل .**

( تەرجــەمە )

٨٥ دەگێڕنەوە لەئــەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێبی . گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) دەی فەرموو بە تەحقیق ئومەتی من بانگ دەکرێن ڕۆژی قیامەت . بەدەم و چاوو دەستو پێ سپی و نوورانی . لە آثار ( شوێنەوار )ی

دەست نوێژ • ئنجا هەر کەسێك پێی دەکرێ زیادە لەحەدی فەرز لە ئەعضای دەست نوێژ بشوا باییکا •

---

**٨٦ عن عبدالله ابن یزید الانصاري (ض) أنــه قال قال رسول الله صلی الله تعالی علیه وسلم • لا ینفتل • او لا ینصرف حتی یسمع صوتا او یجد ریحا •**

( تەرجــەمە )

٨٦ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی یزیدی ئەنصاری شکایەتی بردە بەر پێغەمبەر (د) دەرحەق بەپیاوێك لەنوێژ واخەیال بکا باییکی لێ بەربوو • فەرمووی بانوێژەکەی نەبڕی هەتاگوێی لە دەنگێك دەبی • یابۆنێك دەکا •

---

**٨٧ عن أسامة ابن زید • قال رسول الله صلی الله تعالی علیه وسلم الصلاة امامك فاله دفع من عرفة •**

. ( تەرجــەمە )

٨٧ دەگێڕنەوە لەئوســامەی کوڕی زەید ڕەزای خودای لێ بی • گوتی پێغەمبەر (د) گەڕایەوە لەعەرەفە • ئاگە پیشتە • دۆلێك دابــەزی • ( میزی کرد ) پاشان دەست نوێژێکی سەرسەری شووشت • گوتم یا رسول الله نوێژە فەرمووی نوێژ لەپێش تۆیە •

ئنجا سوار بوو • وەکوو هاتە موزدەلفە دابەزی دەســـت نوێژێکی زۆرباشی شووشت ئنجا قامەت کرا بۆ نوێژ نوێژی مەغریبی کرد • پاشــان

هەرکەس ووشتری خۆی لەقۆناغ ـ یخ کرد ـ پاشان قامەت بوو نوێـژی عیشاکرا • نوێژی عیشاش کرا • ( یەعنی هەردوو نوێژی لەوەقتی عیشا بە جەمع کرد ) •

---

**٨٨ عن أنس رضي الله تعالى عنه قال كان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا دخل الخلاء قال اللهم اني اعوذ بك من الخبث والخبائث •**

( تەرجـەمە )

٨٨ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێبێ گوتی پێغەمبەر(د)• وەکو بیویستایە بچیتە ( ئەدەب خانە ) • لەپێش چوونە ئەدەبخـانە دەی فەرموو ( ئەی خودایە من خۆم دەپارێزم بەتۆ لەشەیتانەکانی نێرومێ )( نەك لەپاش چوونە ژوورەوە • چونکە ڕاگرتنی ناوی خوا بەپاکی نەك ناوهێنانی خوا لەجێگای نالایق هەروەکوو ئایەت دەفەرموی ( سبح اسم ربك الاعلى )•

---

**٨٩ عن ابن عباس رضي الله تعالى عنهما • ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • دخل الخلاء قال فوضعت له وضوء • فقال من وضع هذا فأخبر فقال اللهم فقهـه في الدين •**

( تەرجـەمە )

٨٩ دەگێڕنەوە لەعەبدی کوڕی عەباس • ڕەزای خودای لێبێ •

که پێغەمبەر (د) چووە جێی بەدەستئاو گەیاندن • منیش لەدەرەوە ئـاوی دەستنوێژم بۆدانا •

فەرمووی کەئەم ئاوەی داناخەبەری پێدرا ابنی عەباس بوو • فەرمووی یارەبی مەعریفەتی پێبدەی لەدین • ( واتە شارەزای بکـــەی لەکاروباری ئایین ) •

---

**٩٠ عن أبي ايوب الانصاري (ض) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا اتى احدكم الغائط فلا يستقبل القبلة ولا يولها ظهره • شرقوا أو غربوا •**

**( تەرجـــەمە )**

٩٠ دەگێرنەوە لەئەبی ایوبی ئەنصاری ڕەزای خودای لێبی گوتی: پێغەمبەر فەرمووی • وەکوو یەکێك لەئێوە • چووە سـەر پێشاو • باڕوو لەقیبلە نەکا • پشتیشی تێنەکا بەرتان لەڕۆژهەلات یالەڕۆژ ئاوا بکەن •

---

**٩١ عن ابي قتادە (ض) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا شـرب احـدكم فلا يتنفس في الاناء • واذا أتى الخلاء فلا يمس ذكره بيمينه ولا يتمســح بيمينه •**

**( تەرجـــەمە )**

٩١ دەگێرنەوە لـە ئەبوو قەتادە ( ڕەزای خودابی لێبی ) گوتی فەرمووی پێغەمبەری خودا (د) : وەکوو ئاوی خواردەوە یـەکێك لـەئێوە

باپشی لەقاپەکەدا نەکێشی • وەکوو چووە ئەدەبخانەش بادەستی ڕاستی لەئالەتی ( کیری ) خۆی نەدا وەبەدەستی ڕاستیشی لە دەست بەئاو گەیاندن خۆی نەسڕێتەوە •

---

**٩٢ عن ابي هريرة : قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ابغ احجارا أستنفض بها • ولا تأتني بعظم ولا روث •**

**( تەرجەمە )**

٩٢ دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ـ رەزای خودای لێ بێ • پێغەمبەر گوتی وەکوو چووەسەرپێشاو گوتی چەند بەردێکم بۆ بێنن • خۆم پێ خاوێن بکەمەوە • ئێسقانم بۆمەینە • تەرسیشم بۆ مەینە •

---

**٩٣ عن ابن مسعود (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • هذا ركس فاخذ الحجرين والقى الروثة •**

**( تەرجەمە )**

٩٣ دەگێڕنەوە لەابن مەسعود ڕەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر چووە سەرپێشاو ئەمری پێ کردم سێ بەردی بۆ ببەم •

ئەمنیش دوو بەردم دووزیەوە گەڕام یەکێکی تر نەبوو • لەجیاتی بەردی سێیەم تەرسێکم برد • دوو بەردەکەی گێڕاوە • تەرسەکەی فڕەدا فەرمووی ئەمە پیسە ( لەقاموس ـ رکس • وە ـ رجس ـ مەعنایان یەکە ) •

---

**٩٤ عن عثمان ابن عفان ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال رسول الله ( ص ) من توضأ نحو وضوئي هذا • ثم**

صلى ركعتين . لا يحدث فيهمـا نفسه غفر له ما تقـدم من ذنبـه .

( تەرجـەمە )

٩٤ دەگێرنەوە لە خەلیـەی سێ‌یەم عثمان کوڕی عفـان . ڕەزای خودای لێ‌بی گوتی لەشتێك هەندێ ئاوم بۆبینن . ئاویان بۆهینـا . دوو دەستی خۆی پێ‌شوشت لەپاشان بەدەستی ڕاست لەزەرفەکـە ئـاوی هەلگرت . لەدەمی وەرکرد وە لەلووتی وەرکردو فڕەیدا پاشان سێ‌جار ڕووی خۆی شووشت سێ‌جاریش دەستو باسکی شووشت . هەتا هەنیشك(یەعنی لەگەل هەنیشك . پاشان دەستی تەڕی بەسەری داهێنا (مەسحی سەری کرد).

پاشان قاچەکانی شووشت هەتا قاچەکانی سێ‌جار . لەپاشان فەرموویەتی. هەرکەسێك دەست نوێژ بشوا وەکوو ئەم دەست نوێژەی کەمن شووشتم. پاشان دوو رکعەت نوێژی بکا . بەبێ دالغە . خودا لەهـەموو گونـاهی پێشووی خۆش دەبی . ظاهرا مەبەست لەنوێژی بێ خەتەرە ( دالغە ). هەتا ئینسان پێی بکرێ لەکاتی نوێژ دالغەی لێ‌نەدا چونکی خەتەرە ( دالغە )فکر ڕۆیشتن هەندجار بەدەستە خۆت نی‌یە .

---

٩٥ عن ابي هريرة (ض) ان رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسـلم . قال اذا توضأ احدكم فليجعل في انفـه ماء . ثم لينثره . ومن اسـتجمر فليوتر . واذا اسـتيقظ احدكم من نومه فليغسل يده . قبل ان يدخلها في وضوئه فان احدكم لا يدري اين باتت يده .

( تەرجـەمە )

٩٥ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێبی • کەبـــە حەقیقەت پێغەمبەری خودا (د) فەرمووی وەکوو دەست نوێژی شـــووشت یەکێك لەئێوە • بائاو لەلووتی وەربکا • پاشان فڕەی بـــدا • وە ئەگـــەر کەسێکیش لەکاتی پێشاو بەبەرد خۆی خاوێن کردەوە بابیکاتە تاك • یەعنی بیکاتە سێبەرد یان پێنجبەرد مثلا•وەکوو لەخەویش بەخەبەرهات یەکێکتان• باپێشدان دەستی بشوا • ئنجا دەستی لەناو قاپی دەست نوێژبنێ •

چونکی یەکێك لەئێوە نازانی شەو دەستی لە کوێ بووە یەعنی لەوانەیە لەئەثنای خەو دەستی بەپیسایی کەوتووە •

---

## ٩٦ عن ابي هريرة ــ رضي الله تعــالى عنه ــ ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال: اذا شرب الكلب في اناء احدكم فليغسله سبعا •

( تەرجـەمە )

٩٦ دەگێڕنەوە لەئەبی هورەیرە ڕەزای خودای لێبی کە بەڕاستی پێغەمبەر فەرمووی •

وەکوو خواردیەوەسەگ • لەقاپی یەکێکتان با قاپەکە حەوت جـــار بشوا •

---

## ٩٧ عن ابی هريرة (ض) • قال رسول الله صلى الله

**تعالى عليه وسلم • لا يزال العبد في صلاة ما دام في المسجد ينتظر الصلاة ما لم يحدث •**

( تەرجـەمە )

٩٧ دەگێڕنەوە لەئـەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ • گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) • عەبد هەر لەنوێژدایە • چەندێکی لەمزگەوت بێ • چاودێری نوێژ بکا • مادام بێ دەستنوێژ نەبێ •

**٩٨ عن عائشة رضي الله تعـالى عنها • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • هريقوا علي من سـبع قرب لم تخلل أو كيتهن لعلي اعهد الى الناس •**

( تەرجـەمە )

٩٨ دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران حەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بێ • گوتی وەکوو پێغەمبەر درووودی خوای لەسەربێ • وەکوو پێغەمبەر ناساغی گران بوو • ئازاری بەدەنی زۆر بوو• ئیزنی لە ئافرەتەکانی خواست کەلە خانووی من خدمەتی بکرێ • ئنجا ئیزندرا • پاشـان پێغەمبەر (د) • لەبەین حەزرەتی عەباس و عـەلی کەدەسـتیان پێوە گرتبوو• دەرچوو • قاچەکانی پیرۆزیشی لەبەر بێتاقەتی لەعەردی دەخشا • ئنجا وەکوو گەیشتە ژوورەکەی عائشە فەرمووی •

لەحەوت کوندەی دەرك نەکراوەوە ئاووم بەسەردا بکەن• بەلکی نەختێ سووك دەبم پێم دەکرێ نەسیحەتێکتان بکەم • چونکە ئەمە جـاری ئاخیرە

کەبیانبینم • ئنجا داندرا لەناو ئینجانەیەکی حەفصەی دایکی ئیمانداران •

هەر ئاومانپێدا دەکرد هەتا ئیشارەی فەرموو ئەوا قسەی منتـــــان بەجێ گەیاند • ئنجا چووە دەرێ بۆناو ئەصحاب (د) •

---

**٩٩ عن المغيرة ابن شعبة (ض) قال كنت مـع النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • في سفر ، فاهويت • لانـزع خفيه • فقال دعهما فاني ادخلتهما • طاهرتين فمسح عليهما •**

**( تەرجـــمە )**

٩٩ دەگێرنەوە لەموغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێبی لەگەل پێغەمبەر بووم منیش شۆڕبوومەوە • مەحسەکانی لەقاچی داڕنم فـــەرمووی وازییان لێبینە • قاچەکانم پاك بوون کەلەناووم داناوون • ئنجا لەســــەر مەحسەکانی ــ مەسحی کرد • (واتە بەدەستەکی تەڕ دەســـــتی بەســــەر پێلاوەکانی دا هێنا ــ لەباتی شووشتنی قاچی) •

---

**١٠٠ عن ابن عباس (ض) ان النبي صلى الله عليه وسلم • شرب لبنا فمضمض • وقال (ان له دسما) •**

**( تەرجـــمە )**

١٠٠ دەگێرنەوە لە ابن عباس رەزای خودای لێبی کـــە بەڕاستی پێغەمبـــەر شیری خواردەوەو پاشــــان لەدەمی وەرکرد • وە فـــەرمووی شیر چەورایی‌یەکی هەیە •

١٠١ عن عائشة (ض) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال اذا نعس احدكم . وهو يصلي فليرقد حتى يذهب عنه النوم فان احدكم اذا صلى وهو ناعس لا يدري لعله يستغفر فيسب نفسه . وروي عن أنس . فلينم حتى يعلم ما يقرأ .

( تەرجـەمە )

١٠١ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بێ بەڕاستی پێغەمبەری خودا فەرمووی . وەکوو بۆرژی . یکیکتان . لەنوێژیشدابوو . بابخەوی هەتا خەوی دەڕوا . چونکە وەکوو یەکێکتان نوێژ بکاو بنبۆرزێ . نازانی .

لایقە لەخوا بپاڕێتەوە کەچی جنێو بەخۆی دەدا لە ئەنەسیش دەگێڕنەوە . کەپێغەمبەر (د) فەرمووی با بنوی هەتا بزانی چی دەخوێنێ .

---

١٠٢ عن ابن عباس رضي الله عنهما : قال النبي (ص) يعذبان وما يعذبان في كبير . بلى كان احدهما لا يستتر من بوله . وكان الاخر يمشي بالنميمة .

( تەرجـەمە )

١٠٢ دەگێڕنەوە لە ابنی عبـاس . ڕەزای خودای لێ بێ . ووتی پێغەمبەر (د) . لەنزیك قەبرستان بەلای دیوارێکی مەدینەدا ڕەت بوو . گوێی لەدەنگی دوو انسان بوو عەزاب دەدران . لە نـاو قەبـریان .

پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمانە عەزاب دەدرێن • واش نی یە لەبەر گوناهێکی گەورەبی عەزاب دەدرێن • پاشان فەرمووی ( بەڵێ ) • یەکیکیان خۆی لەمیز نەدەشاردەوە • ئەوی تریشیان دوو زمانی دەکردەوە قسەی لەبەینی خەلکی دەهیناو دەبرد • پاشان فەرمووی شوورێکی دارخورمای تــــەڕم بۆبینن • هینایان •

کردیە دووپارچە • هەرقەبرێك پارچەیەکی لەسەر دانا • عــــەرزی کرد بۆچی وات کرد • فەرمووی لەوانەیە عەزابیان لەسەر سووك بکرێ مــادام روشك نەبن •

بۆیە دەگوترێ ( لەسەر قەبردانانی شووڕی تەڕ عەزابی قەبر ســـووك دەکا )•

---

## ١٠٣ عن ابي هريــرة (ض) قــال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم دعوه • وهريقوا على بوله سجلا من مـــاء او ذنوبا من ماء • فانما بعثتم ميسرين ولم تبعثوا مفسرين•

( تەرجـــەمە )

١٠٣ دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە — ڕەزای خودای لێ بێ — گوتی عەرەبێکی سەحرانشین هەلستا میزی لەناو مزگــەوت کــرد • ئەصحــاب عروضی ئەزیەتو لێدانیان کرد • پێغەمبەر (د)فــــەرمووی وازی لێ بینن • دەولکێکی پڕ لەئاو لەسەرمیزەکەی ڕووکــەن • چونکی بەڕاســـتی ئێوە کەئومەتی منن • بۆیێ ئارڕاونی امور لەسەر خەلکی ئاســان بکــەن بۆیێ نەناررِاون امور بەزەحمەت بخەن •

١٠٤ عن اسماء (ض) قال رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم تحته ثم تقرصه بالمـاء وتنضحـه وتصلي فيه • ش

١ ـ تحته : أي تحكه ـ تدلكه

٢ ـ تنضحه : اي تصب عليه الماء قليلا قليلا •

( تەرجـەمە )

١٠٤ دەگێرنەوە لـە اسـماء ( ڕەزای خودای لێ بێ ) • گوتی ئافرەتێك هاته خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی خەبەرم پێ بدە یەكێك لەئێمـە دەكەویتە حەیز لە لباس خویدا چی بكا لە لباسەكە • فەرمووی بیگوشی پاشان بەنینۆكو ئەنگوستەكانی خوێنەكەی هەلبقـەنی وە ووردە ووردە ئاویشی پێدا بكاو نوێژی پێوە بكا •

---

١٠٥ عن عائشة رضي الله تعالى عنها : قال رسول الله (ص) لا انمـا ذلك عـرق وليس بحيض فـاذا اقبلت حيضتك فدعي الصلاة • واذا أدبرت فاغسلي عنك الدم • ثم صلي • ثم توضيء لكل صلاة حتى يجيء ذلك الوقت •

( تەرجـەمە )

١٠٥ دەگێرنەوە لە دایكی ئیمانداران حـەزرەتی عائشـە ڕەزای خودای لێ بێ ( گوتی فاطمەی كچی ئەبی جوبەیش هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی من ئافرەتێكم بەدەوام خوێن دەبینم پاك نابمەوە ئەرێ ئنجا من تەركی

نوێژ بکەم ) • فەرمووی ( نا ) ئەم خوێنەی دائمی لەفەســـادی دەمارەوەیە حەیز نی‌یە • ئنجا ئەگەر کەوتی‌یە حەیز واز لەنوێژ بینـــە • وەکوو مودەی اعتیادی حەیزیشت ڕۆیی‌و خوێنی‌شت دیت• • خوێنەکەت بشۆ پاشـــان نوێژبکە • لەپاشدان بۆ هەموو نوێژێك دەســت نوێژ بشۆ • هەتــا وەقتی حەیزت کەبەخۆت دەزانی •

---

**١٠٦ عن ميمونة رضي الله تعالى عنها • ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • قال القوها ومـا حولهـا وكلوا سمنكم •**

( تەرجــەمە )

١٠٦ دەگێڕنەوە لەمــەیموونە ( ڕەزای خودای لێ‌بی ) • بەڕاستی پێغەمبەری خودا (د) پسیاری لێ‌کرا مشك کەوتبیتە ڕوون مشکەکە فڕێدەن• ئەطرافی مشکەکەش فڕێدەن لەڕوون • ڕوونی خۆتان بخۆن •

---

**١٠٧ عن ابي هريرة (ض) ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال كل كلم يكلمه المسلم في سبيل الله يكون يوم القيامة كهيئتهـا اذا طبعت تفجـر دومـا فاللون لون الدم والعرف عرف المسك •**

( تەرجــەمە )

١٠٧ دەگێڕنەوە لــە ئــەبوو هورەیرە • ڕەزای خودای لێ‌بی • بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی• هەرموسولمانێك برینداربکرێ بــە برینێك

لەرێگای دینی خودا • لەرۆژی قیامەت وەکوو تازە بریندار کرابی • خوێنی لێجاری دەبێ ئنجا رەنگی خوێنە • بێنیش بێنی مسکە •

---

**١٠٨ عن ابي هريرة (ض) عن النبي (ص) انه قال لا يبولن احدكم في الماء الدائم الذي لا يجري ثم يغسل فيه •**

( تەرجەمە )

١٠٨ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە — رەزای خودای لێ بێ — کەبێ گومان پێغەمبەر (د) فەرمووی بامیز نەکا یەکێکتان لەئاوی راوەستاوی لەبەری نەروا • پاشانیش غوسلی تیابکا •

---

**١٠٩ عن ابن مسعود • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم اللهم عليك بقريش • اللهم عليك بقريش • اللهم عليك بأبي جهل • وعليك بعتبة ابن ربيعة وشيبة ابن ربيعة والوليد ابن عتبة وامية ابن خلف • وعقبة ابن ابي معيط وعد السابع فنسيه الراوي •**

( تەرجەمە )

١٠٩ دەگێرنەوە لەکوری مەسعود پێغەمبەر (د) • لەلای ( بەیت) نوێژی دەکرد • ئەبوو جەهل و رەفیقەکانی دانیشتبوون • هەندێکیان بەهەندێکیان گوت • کامەتان ناو زگو منالدانی ووشتری کوژرایەوەی فلان قەبیلە • دەینێ •

وەکوو محمد سەجدەی برد باوێتە سەرپشتی یەدکارترینی قەومەکە چوو • انتظاری کرد هەتا پێغەمبەر (د) سەجدەی برد • لەناوەندی

هەردووشیانی داناً • منیش خۆم تەماشامدەکرد • فەقەط هیچ مودافەعەم پێ نەدەکرا • کاشکی شتێکم پێ بکرایە •

ئنجا پێ دەکەنین خۆ بەخۆیی یان • ئەو دەیگوت خەتای تۆبوو • ئەو دەی ووت خەتای تۆبوو • پێغەمبەر (د)هەر لەسەجدە دابوو سەری ڕاست کردەوە فەرمووی خودایا قورەیش بەهیلاك نەدەی سێ جار وای فەرموو کافرەکان گوێیان لەم دعایەبوو • زۆریان پێ ناخۆش بوو • چونکی گومانیان وابوو لەمشارە مستجابە • پاشان یەك یەك ناوی هەموویانی برد فەرمووی خودایا • ئەبوو جەهل و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبەو ئومیەی کوڕی خەلەف و عوقبەی کوڕی موعیط • تەهیلاك بدەی ڕاوی دەلێ ناوی حەوتەمینێکیشی برد لەبیرم چوو • ابنی مەسعود گوتی قەسەم بەوزاتەی ڕووحی منی بەدەستە • دیتم ئەوانەی پێغەمبەر (د) حسابی کردن • کەلاکیانفڕەدرایە ناو ( قەلیب )بیرێکە لەبەدر •

---

**١١٠ عن ابن عمر رضي الله تعالى عنهما • ان النبي (ص) قال أراني تسوك بسواك • فجاءني رجلان احدهما اكبر من الاخر • فناولت السواك الاصغر منهما فقيل لي كبر فدفعته الى الاكبر منهما •**

**( تەرجەمە )**

١١٠ دەگێڕنەوە لە عبدالله کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی • بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی خۆم دیت لەخەو بەسیواکیك سیواکم دەکرد • دوو پیاو هاتنەلام • یەکێکیان بەتەمەن گەورەتربوو منیش

سیواکەگەم بە بچووکەکەدا ، لەتەرەف جوبرائیل پێم گوترا ، بەگەورەگـە بدە ئەو استحقاقی تەقدیمی هەیە ، ئنجا دامە گەورەکەیان ،

---

**١١١ عن البراء ابن عازب ، رضي الله تعالى عنهما ، قال : قال النبي صلى الله تعالى عليــه وســلم ، اذا اتيت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة ، ثم اضطجع على شقك الايمن ، ثم قل اسلمت وجهي اليك وفوضت أمري اليك ، والجأت ظهري أليك رغبة ورهبة اليك ، لا ملجاء ولا منجـا منك ، الا اليك ، اللهم آمنت بكتابك الذي انزلت ونبيــك الذي ارســـلت ، فان مت من ليلتك فانت على الفطـرة واجعلهن آخر ما تتكلم به ،**

**قال فرددتها : على النبي صلى الله تعالى عليه وســلم فلما بلغت اللهم آمنت بكتابك الذي انزلت قلت ورســولك قال : لا : ونبيك الذي ارسلت ،**

( تەرجــەمە )

١١١ دەگێڕنەوە لە براءکوڕی عازب ( ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ، وەکوو هاتی بە ســەرجێگای خەوتن ، دەســـت نوێژێك بشۆ وەکوو دەستنوێژی بۆنوێژ ، پاشان پالدەوە لەسەر تەنیشتی ڕاست ، پاشان بلێ زاتی خۆم تەسلیم بەتۆ کرد اموری خۆم بەتۆ ئەسپاردە وپالیشمدا بەپشتی خۆم وەبالــە تۆ ، بەئیشتیاقی احســانی تۆ وە تـرس لەعەزابت ، هیچ پەنایێك نیەو هیچ جێگای نەجاتیش نیە لەتۆ مەگــەر

بۆلای تۆ ئەبێ • ئەی خودایا• ایمانم هینا بەکتابی توو کە ناردوتە خوارێ•
وە بەپێغەمبەری تۆش کەناردووتە • ئنجا ئەگەر تۆمردی لەوشەوە ئەوا تۆ
لەسەر دینی اسلام چووی • وە ئەم کلیما تانەش بگێرە بەنهـایەتی هـەموو
قسەت ڕاوی دەلێ • چەند جارێکم ئەم کلیمانە خوێندەوە بۆ پێغەمبەری (د)
وکوو گەیشتمە بکتابك الذی انزلت گوتم ورســولك • فـەرمووی • لا •
وامەلێ • بلێ : ونبیك الذی ارسلت • ئەوەك تکرار لازمبێ لەگەل ارســلت
وە هیچ پێغەمبەرێکیش هەتا نەنێردرێ نابیتە نێردراو ( رسول ) • هەر بۆی
ئەگوترێ ( ننبی ) لەپاش ئەمر بە تەبلیغی ئەحکام بەخەلقی ئەبێتە رسول •

# كتاب الغسـل

## باسى خۆشـووشتن

بسـم الله الرحمن الرحيم

بەناوى خوداى ڕزقدەرى ڕەحمبـەر

**١١٢ عن جبير ابن مطعم رضي الله عنه قـال : قال رسول الله (ص) أما انا فأفيض على رءسي ثلاثا وأشـار بيـديه كلتيهما .**

( تەرجـەمە )

١١٢ دەگێڕنەوە لەجوبەيـرى كوڕى مطعم ڕەزاى خوداى لێ بى گوتى پێغەمبەر (د) فەرمووى ئەما ئەگـەر لەمن دەپرسـن من چلۆن خۆم دەشۆم . بەهەردوو دەست ئيشارەى فەرموو . ووتى من ٣ سێ جار ئاو بەسەر سەرى خۆمدا ئەڕێژم كەهەموو جەسەدم بگرێتەوە .

**١١٣ عن ابى هريرة رضي الله تعالى عنه قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم مكانكم قاله في مصـلاة ثم رجـع فاغتسل ثم خرج الينا ورءسه يقطر فكبر فصلينا معه .**

( تەرجـەمە )

۱۱۳ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێبێ • گوتی قامەت بۆ نوێژکرا • ڕیزەکانی جەماعەتیش ڕاست اکرانەوە بە ڕاوەسـتاوی پاشان وەکوو پێغەمبەر (د) ئیرادەی کرد نیەتی نوێژ بینی کەوتە یادی کـە بەجەنابەتە ئنجا بەئێمەی گوت لەجێگای خۆتان بن چوو غوسلی کـردو هاتەوە میحراب •

ئاوی لەسەری پیرۆزی دەچکایەوە •

هەر بەقامەتی پێشوو • نوێژی دابەست ئەمە حوجەتە بۆقسەی جمهور • کەفەصل لەبەینی نوێژو قامەت دروستە • بەقسە چیکەم چی زۆر مطلقـا • بەفعلیش ئەگەر بۆ مەصلەحەتی نوێژ بێت هەروەکوو لەقەسطلانی لە جلدی (۱) ص (۳۲۳) وادەلێ •

---

**۱۱٤ عن ابي هريـرة (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال كانت بنو اسرائيل يغتسلون عراة • ينظرون بعضهم الى بعض • وكان موسى يغتسل وحده فقالوا والله ما يمنع موسى ان يغتسل معنا الا انه آدر • فذهب مرة يغتسل فوضع ثوبـه على حجر ففـر الحجر بثوبه فخرج موسى في اثـره يقول ثوبي يـا حجـر ثوبي يا حجر حتى نظرت بنو اسرائيل الى موسى فقـالوا والله ما بموسى من بأس واخذ ثوبه فطفق بالحجر ضربا ـ قال ابو هريرة والله انه لندب بالحجر سـتة او سبعة ضـربا بالحجر •**

( تەرجـەمە )

١١٤ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە • ڕەزای خودای لێبی ئەویش لەپێغەمبەر (د) فەرمووی عادەتی بەنی ئیســـرائیل وابوو بەڕووتی خۆیـان دەشووشت تەماشای یەکتریان دەکرد • مووساش بەتەنیا غوسـلی دەکرد • گوتیان قەسەم بەخودا • مووسی قۆڕە بۆیێ لەجێگای تەنیا غوسل دەکـا • ئنجا ڕۆژێك • چووبووە جێگایەك بۆ غوسل ( خۆشووشتن ) • جلکەکەی خۆی لەسەر بەردێك دانابوو • ئنجا بەردەکـە بەجلکەکەوە ڕای کـرد • مووساش کەوتە شوێنی هەردەیگوت جلکەکەم بدەوە ئەی بەردەکە • هەتـا هاتە ناو بەنی ئیسرائیل تەماشای عەورەتیان کرد دیتیان قۆڕ نــەبوو • گوتیان واللە موسا چە بەلای لێنیە • جلکەکانی خۆی لەبەردەکە سەندەوە• ئنجا مالەبەرد بدا •

ئەبوو هورەیرە دەلێ قەسەم بەخودا شوێنەواری لێدانی شەش • یاخود حەوت جێگا لەبەردەکە دیاربوو •

---

**١١٥ عن ابي هريرة (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • قال بينا ايوب يغتسل عريانا فخر عليه جراد من ذهب فجعل ايوب يحتثي في ثوبه • فناداه ربــه يا ايوب ألم اكن اغنيتك عما ترى • قال بلى وعــزتك ولــكن لا غنى لي عن بركتك •**

( تەرجـەمە )

١١٥ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە • ڕەزای خودای لێبی ئەویش

له پێغەمبەر (د) فەرمووی وەقتێك ئەیووب پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ غوسلی دەکرد • ڕووتبوو • ڕەوەکلۆتێکی لەزێڕی داوەریە سەری • ئنجا ئەیووب کلۆیەکانی دەگرت دەی خستە ناو جلکی خۆی پاشان خودا بانگی کرد • ئەی ئەیووب • ئەدی من تۆم بێ نیاز نەکردووە لەم کلۆیە زێڕانە • ئەیووب ووتی : با • بێ نیازت کردوومە لەهەمووشت بەلام بێ نیازی نی یە بۆمن لەخێرو بەرەکەتی تۆ •

---

**١١٦ عن ابي هريرة (ض) • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • اين كنت يا أبا هريرة سبحان الله ان المؤمن لا ينجس •**

**( تەرجەمە )**

١١٦ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە • ڕەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر (د) لەهەندێ ڕێگای مەدینە تووشم هات • لەشیشم بەجەنابەت بوو • گوتی خۆم لێ دزی یەوە بەئازایی چووم غوسلم کرد پاشان هاتمەوە خدمەتی • فەرمووی لەکوێ بووی ئەی ئەبوو هورەیرە • گوتم لەشم بەجەنابەت بوو واتە غوسلم لەسەربوو • پێم ناخۆش بوو • لەگەلت دانیشم بەلەشەکی پیس • ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی سبحان الله بەتەحقیق ئیماندار پیس نابێ •

---

**١١٧ عن عمر رضي الله تعالى عنه • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • نعم • اذا توضأ احدكم • فليرقد وهو جنب •**

( تەرجـــەمە )

١١٧ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بێ ، ع رزی پێغەمبەری کرد(د) ئەرێ دەنوێ یەکێك لەئێمە لەشێوی پیس بێ غوسلیشـــی لەسەر بێ ، فەرمووی ئارێ ، وەکوو یەکێکتـــان لەشی بەجـــەنابەت بوو بادەستنوێژ بشواو بخەوی قەیناکا ،

---

## ١١٨ عن ابي هريرة رضي الله تعـــالى عنـــه ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ، اذا جلس بين شـــعبها الاربع ، ثم جهدها فقد وجب الغسل ،

( تەرجـــەمە )

١١٨ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ فەرمووی پێغەمبەر (د) وەکوو دانیشت پیاو لەبەینی چوار پەلی ئافرەت ، پاشان خۆی پێوە خەریك کرد هەتا مولاقاتی خەتانەبێ بوو ( واتە گەیشتنی سەری کێری پیاو بەقوزی ئافرەت ) ، بەبێ گومان غوسل واجب دەبی باانزالیش نەبێ،

# كتـــاب الحيض

## باسی حەیزو بێنوێژی ژنـــان

١١٩ عن عائشة رضي الله تعالى عنها . قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ما لك انفست ـ ان هــذا امــر كتبه الله على بنـــات آدم فاقضي ما يقضي الحاج غير ان لا تطوفي بالبيت .

( تەرجــەمە )

١١٩ دەگێرنەوە لەعائشە رەزای خودای لێ بی گوتی لە (سەرفەر) بووم لەمەکەوە (١٠) میل دوورە پێغەمبەر (د) هاتەلام منیش دەگریـام . فەرمووی چیتە کەوتی‌یە حەیز : هارێ فەرمووی ئەمە کارێکە خودا لەسـەر کچانی ئادەمی نووسیوە . هەرچی حەجاج دەیکەن تۆش بیکە طەوافی (بیت) نەبێ . طەواف مەکە .

---

١٢٠ عن ابي سعيد الخدري (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم . يا معشــر النساء . تصدقن فاني ارينكن . اكثر اهل النار . تكثرن اللعن وتكفرن العشير . ما رأيت من ناقصات عقل ودين . اذهب للب الرجل الحازم . من احداكن . اليس شهادة المرءة مثل نصف شهادة الرجل .

**فذالك من نقصان عقلها . اليس اذا حاضت لم تصل ولم تصم فذلك من نقصان دينها .**

( تەرجەمە )

١٢٠ دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعید خودری ــ ڕەزای خودای لێبێ . لەڕۆژی جەژنە پێغەمبەر هاتە مزگەوت بۆ نوێژ . بەلای هەندێ ئافرەتاندا ڕەت بوو . فەرمووی ئەی عەشیرەتی ئافرەتان . صەدەقەو خێربکەن بێشك ئێوە نیشانیمن دران . بە زۆرترینی **ئەهلی ئاگر** . ئافرەتەکان گوتیان لەبەرچی یا رسول الله . فەرمووی لەعنەت زۆر لە خەلکی دەکەن . وەئینکاری چاکەی مێردتان دەکەن . هەر چاکەیەکی لەلایەن مێردتان بێ بەکەمی دەزانن . نەمدیت لەهەرچی ناقص العقل بێ وناقص الدین بێ . خرابتربێ . بۆلابردنی عەقلی خالص پیاوی عاقل . لەیەکێك لەئێوە . ئافرەتەکان گوتیان . کەمی عەقلو دینمان چییە یا رسول الله . فەرمووی . ئەدی شاهیدی ئافرەت نیوەی شاهێدی پیاو نییە . گوتیان وایە ــ فەرمووی ئەمە لەبەر کەمی عەقلیانە . فەرمووی ئەدی ئافرەت . وەکوو بکەوێتە حەیز نەنوێژ دەکا نەڕۆژوو دەگرێ . گوتیان وایە فەرمووی ئەمەش لەبەر نوقصانی دینیانە .

---

**١٢١ عن عائشة . قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم خذي فرصة من مسك فتطهري بها . سبحان الله تطهرى .**

( تەرجەمە )

١٢١ لە حەزرەتی عائشە ــ ڕەزای خودای لێبێ ــ دەگێڕنەوە .

ئافرەتێك پرسیاری شووشتنی لە حەیز کرد • لە پێغەمبەر (د) فەرمووی بگرە پارچەیەك لەمسك • ئنجا خۆتی پێ پاك بکەوە • ئافرەتەکە گوتی چلۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە پێغەمبەر (د) فەرمووی سبحان الله خۆتی پێ پاك بکـــەوە • منیش ێ گەیشتم لەبەر تێنەگەیشتنی ئافرەتەکە لەمەقـــامی تەعــەجوب فەرمووی سبحان الله • ئافرەتەکەم بۆلای خۆم ڕاکێشا • پێم گوت بەپارچە مسکەکە خەریکی لابردنی ئەثەری خوێن بە •

---

## ١٢٢ عن عائشة • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم أنقضي رءسك وامتشطي وأمسكي عن عمرتك •

( تەرجـــەمە )

١٢٢ دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران • حەزرەتی عائشـــە ڕەزای خودای لێ بێ • لەحەجەتوالوداع ئیحرامم بەست • لەگەل پێغەمبەر ( د ) • کەوتمە حەیز پاك نەبوومەوە • هەتا شەوی عەرەفە داخل بوو گوتم یا رسول الله ئەمە شەوی عەرەفەیە • منیش بەعومرە تەمەتوعم کـــردووە • فەرمووی پرچی سەرت بکەوە • وە شەی بکەو واز لە ـ عومرەکـــەی خۆت بینـــە ( موراد لەو وازهینانی عومرە خروج نییە • چونکی خروج لەحەج و عومرە نابی بەتەحەلول نەبی • بەلکی دەبیتە قارنە • لازمیش ناکا لەپرچ کردنەوەو شەکردن ابطالی حەج و عومرە • چونکی لای ئێمە جائزن لەئیحرام • بـــەلام لەترسی هەلقەنانی موو مەکرووهن ) • هەروەکوو لەقەســـطەلانی وادەلێ • (لای شافعی جائزە پرچ کردنەوەو شەکردن لە ئیحرام ) •

---

## ١٢٣ عن عائشة (ض) قال النبي صلى الله تعـــالى عليه

**وسلم من احب ان يهل بعمـــرة فيهلل . فلولا اني اهــديت لاهلكت بعمرة .**

( تەرجــەمە )

١٢٣ دەگێڕنەوە لەحـــەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێبی پێنج شەو مابوو بۆ مانگی ذی الحجە لەڕۆژی شەمبە لەمەدینە دەرچووین بۆحەج پێغەمبەر (د) فەرمووی . هەرکەسێك حەزدەکا ئیحرام بەعومرە ببەســتی . بابیکا منیش ئەگەر لەبەر ئەمە نەبوایە کە هەدیو قوربانیم حــازر کردووە . ئیحرامم بەعومرە دەبەست .

---

**١٢٤ عن أم عطية (ض) قالت سمعت رســول الله (ص) يقول تخــرج العواتــق وذوات الخـدر . والحيض وليشهدن الخير . ودعوة المؤمنين . ويعتزل الحيض المصلى .**

( تەرجــەمە )

١٢٤ دەگێڕنەوە لە ئومی عطیـــە ڕەزای خودای لێبی . گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) دەی فەرموو دێنەدەرێ کچـــەکانی تازەپێگەیشتوو وخاتوونەکانی مەستوورە . وە حەیز دارەکانو بابیشبینن جێگایەکانی خەیرو طاعەتو دەعوەتی ئیماندارانو وە خۆیان بپارێزن حەیزدارەکان . لەجێگای نوێژ . ( یەعنی نەچنە مزگەوتان ) .

---

**١٢٥ عن عائشة (ض) قال رســول الله صلى الله تعالى عليه وسلم لعلنا تحبنا ألم تكن طافت معكن فاخرجي .**

( تەرجـــەمە )

١٢٥ دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە گوتی عـــەرزی پێغـــەمبەرە کرد (د) کە صەفیە کەوتووتە حەیز پێغەمبەر (د) فەرمووی تەمـــــای وایــە حەبســان بکا لەمەکە نەچینەوە بۆمەدینە لەبەر حەیز هەتـــا پاکدەبێتـــەوە بۆ خاتری طەوافی بەیت • ئەدی طەوافی بەیتی لەگەل ئێوە نەکرد گوتیان کردی فەرمووی بچوونە دمرێ چونکی طواف الوداع ساقطە بەحەیض •

# كتــاب التيمم

## باسى تەيەمموم

---

١٢٦ عن جابر (ض) ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال اعطيت خمسا لم يعطهن احد قبلي . نصــرت بالرعب مسيرة شهر . وجعلت لي الارض مسجدا وطهورا فايما رجل من امتي ادركتــه الصلوة فليصل واحلت لي الغنائم . ولم تحل لاحد قبلي واعطيت الشفاعة . وكان النبي يبعث الى قومه خاصة . وبعثت الى الناس عامة .

( تەرجــەمە )

١٢٦ دەگێڕنەوە لەجــابر ڕەزای خودای لێ بێ بــە حەقیقــەت پێغەمبەر (د) فەرمووی پێنج شت بەمنی دراوە لەپێش من بەکــەس نەدراوە یەکی یان : غەلەبەم دراوەتێ لەسەر دوژمن بەترس کەدەخرێتە نــاو دلی . ڕێگای مانگێك وەکوو ناوی منی بیست .

(دووەم . عاردیش گێڕراوە بۆمن بەمزگەوتو بــە بەدەلی ئــاوی دەستنوێژ . هەرپیاوێك لەئومەتی من وەقتی نوێژی پێ گەیشت بانوێژبکــا ( بەلام پێغەمبەرەکانی تر بەئومەتیانەوە دەبوایە بەئاو دەستنوێژ بشۆن . وە لە مەعبەدیش ( پەرستگا ) نوێژ بکەن .

سێیەم : بۆمن حەلال کراوە تالانی کافران بەلام بۆ ئەنبیای تر حەرام بووە دابەش کردنی تالان ( غنائم ) . بەلکی ئاگرێك هاتووە ماڵەکەی سووتاندووە . ( لەقەسطەلانی وادەلێ ) .

(چوارەم) : بەمن کەرەم کرا شەفاعەت .

(پێنجەم) : غەیری من لە پێغەمبەران هەریەك بۆ قەومی خۆی ناردراوە. بەلام من ناردراوم بۆ عمومی ئینسان .

---

**١٢٧ عن عمار ابن یاسر (ض) قال النبي صلی الله تعالی علیه وسلم . انما کان یکفیك هکذا .**

**( تەرجەمە )**

١٢٧ دەگێڕنەوە لەعەماری کوڕی یاسر . بەحەزرەتی عومەری گوت . ڕەزای خودای لێبێ . ئەرێ بەفکرت نایێ وەکوو منو تۆ لە سەفەر بووین . تۆ نوێژت نەکردبوو بەلام من هەموو قالبی خۆم لەخاك وەردا وە نوێژم کرد . ئەم قسەم عەرزی پێغەمبەر کرد . فەرمووی بۆتۆ کەتەیەمووم بکەی ئەمەندە بەسە . بەم نەوعە هەر دەستی پیرۆزی لەعەردیدا . فوێکی لێکردن بۆ تەخفیفی تۆز . پاشان بەڕوویی خۆیو دەستەکانی خۆی داهینا.

---

**١٢٨ عن عمران ابن الحصین (ض) قال رسول الله صلی الله تعالی علیه وسلم . لا ضیر او لا یضیر آتحلوا . ما منعك یافلان ان تصلي مع القوم علیك بالصعید فانه یکفیك . اذهبا وابتغیا الماء . اسقوه واستقوا . اذهب فافرغه علیك .**

**اجمعوا لها . تعلمين ما رزئنا من ماءك شـيئا . ولكن الله هو الذي أسقانا .**

( تەرجــەمە )

١٢٨ دەگێڕنەوە لەعەمران کوڕی حصینی خزاعی ــ رەزای خودایان لێ بێ . گوتی لەسەفەرێك بووین لەخدمەت پێغەمبەر صلی‌الله تعالی علیه‌وسلم شەوێك تاتزیکی بەیان ڕۆیشتین . وەکوو دابەزین . کەوتینە خەویکی زۆر خۆش بەگەرمایی خۆر بەخەبەر هاتین . لەپێش هــەموومان سێ‌پیـــاو بەخەبەرهات ــ چوارەمین . حەزرەتی عومەر . ڕەزای خودای لێ‌بێ عادەتیش وابوو پێغەمبەر (د) . ئەگەر لەخەودا بوایە هەتا خۆی هەڵنەستابوایە کەس بەخەبەری نەدەهینا . چونکە نەمانئەزانی لەم خەوە لەچە حالەتێکە . ئنجــا وەکوو حەزرەتی عومەر بەخەبەرهات . دیتی عالەم تووشی مصیبــەتی نوێــژ چوونی سبەینە بوونە . پیاوێکی بەجەسارەتیش بوو چەند جار بەدەنگیکی بەرز گوتی الله‌اکبر هەتا پێغەمبەر (د) بەدەنگی ئەو بەخەبەرهات ئنجا وەکوو بەخەبەرهات . ئەصحاب شکایەتی ئەحوالی خۆیان لەخدمەت کــرد ( فەرمووی قەیناکا بارکەن ) . ئنجا زۆر نەڕۆیشتین . پاشـــان دابــەزی فەرمووی ئاوی دەستنوێژم بۆبینن . دەست نوێژی شــووشتو بانگ‌درا ونوێژێکی بەجەماعەتی بۆخەلکی کرد . وە لەنوێژ بۆوە دیتی پیــاوێك جودا لەخەلك نوێژی نەکردبوو ڕاوەستابوو فەرمووی ئەی فلان لەبەرچی نوێژت لەگەل قەوم نەکرد ) گوتی جەنابتم تووش‌بوو ئاویش نییە . فـــەرمووی ( تەیەموم بەخاك بکە کافیە ) . پاشان کەوتە ڕۆیشتن . عالەم شـــکایەتی تینووبوونیان لەخدمەت کرد . ئنجا دابەزی بانگی حەزرەتی علی‌و پیاوێکی

تری کرد • فەرمووی بچۆن ئاوم بۆ بدۆزنەوە • ئنجـــا ڕۆیشتن تووشی ئافرەتێك هاتن لەبەینی دوو کوندەی زل سوارببوو لەئاو • پێیان گوت ئەی ئافرەت ئاو لەکوێ‌یە • گوتی دوێنی ئەو وەقتە لەســـەر ئـــاو هـــاتووە پیاوەکانیشمان بزربووینە • بلاوەیان کردووە بۆئاو گوتیـــان کەوایە وەرە لەگەلمان •

گوتی بۆکوێ گوتیان بۆلای پێغەمبەری خودا • گوتی ئـــەو پیاوەی کەدەلێن دینی باب‌و باپیری خۆی تەرك کردووە گوتیان هارێ: ئنجا هینایانە خدمەت پێغەمبەر (د) قسەکانیشیان بۆ گێڕایەوە • فەرمووی لەووشترەکەی دای بەزێنن • ئەمری فەرموو زەرفێکم بۆ بینن دەرك بەســـتی لەهەردوو دەرگەی کوندە کردمەوە • ( بانگ کرایە عالەم حەیواناتت ئاوبدەن خۆشـــتان بخۆنەوە ) • ئنجا خواردیەوە حەیواناتیان ئـــاودا • لە ئاخـــریدا • ئاویـــدا بەوپیاوەی لەشی‌یە جەنابەت‌بوو فەرمووی ( بچۆ ئاو بەخۆت دابکە ) •

ژنەکەش هەر ڕاوەستابوو • کەچی لەئاوەکەی دەکا • تەماشای دەکردە قەسەم بەخودا لەپاش هەلڕژانی ئەم هەموو ئاوە • وا دەهاتـــە خەیالمـــان کوندەکان لەجاران پڕترن•ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی•(بۆی گردبکەنەوە)• ئنجا لەئاردو لە[1] پۆخین‌و طەعامات بۆیان کۆکردەوە لەجـــەوالیکیان کـــردو خستیانە سەرپشتی ووشترەکەی • فەرمووی ( خۆت دەزانی هیچ شـــتێك لەئاوی تۆمان کەم‌نەکردووتەوە بەلام هەر خودابوو ئاوی بەئێمەدا • ئنجـــا ئافرەتەکە هاتەوە ناو قەومەکەی • بەلام نەچووە لایان گوتیان بۆچی دیارنی گوتی شتێکی سەیروعەجیبم چاوپێ‌کـــەوتووە هـــەرچی چـــاوپێ‌کـــەوتبوو

١ ــ پۆخین گەنم یانۆك سۆردەکرێنەوە دەکوترێ وەکوو ئارد بۆ خواردن •

حیکایەتی بۆکردن • پاشان گوتی واللە لەبەینی عاردو ئاسمان یاخۆ
ـحرتر پەیدا نابێ یاخۆ پێغەمبەرێکی حەقە لەتەرەف خودا• ئنجا لەپاش
ئەورۆژە ئەگەرچی ئیسلام لەشکریان دەکردە عەشایری ئەترافی قەومەکەی•
بەلام دەخلی قەومەکەیان نەدەکرد • چونکی ئومێدیان هەبوو موسولمان بین•
ـشان ڕۆژێك ئافرەتەکە گوتیە قەومەکەی خۆی اعتقادم وایە ئەم قەومە
بەخصوصی موداخەلەی ئێوە ناکەن • بۆچی مسلمان نابن • ئنجا بەگوێیان
کرد هەموو موسولمان بوون •

## كتــاب الصــلاة

## باسی نوێــژ

---

بســـم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای ڕەحمەنی ڕەحیـم

**١٢٩ عن ابي هريرة رضي الله تعالى عنه • ان سائلا سئل رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم عن الصلوة في ثوب واحد • فقال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • ولكلكم ثوبان •**

( تەرجـــەمە )

١٢٩ دەگێڕنەوە لە ئەبووهورەیرە ــ ڕەزای خودای لێ بێ • یەکێك سؤالی لە پێغەمبەر کرد (د) لە نوێژ کەلە یەك پەشتەمالی ئیحرامـــدا بکرێ • عەجەبا جائزە • یاخۆ جائز نییە • فەرمووی بە استفهامی ئینکاری ئـــەرێ بۆ هەمووتان دوو پەشتەمالی ئیحرام هەیە • یەعنی جائزە مـــادام عـــەورەت داپۆشی •

---

**١٣٠ عن ابي هريرة (ض) قال أشهد اني ســمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • لا يصلي احــدكم**

**في الثوب الواحد ، ليس على عاتقه شيء ،**

( تەرجـــەمە )

١٣٠ دەگێڕنەوە لە ئەبووهوڕەیرە ــ ڕەزای خودای لێ بێ ، گوتی
من شەهادەت دەدەم بیستم لە پێغەمبەر (د) بانوێژ نەکا یەکێك لەئێوە لەیەك
پەشتەمالی ئیحرامدا ، لەسەر شانی نەبێ هیچ شتێك لەپەشتەماڵەکە ، چونکی
سەتری عەورەتی بۆ ناکرێ ، بەلام ئەگەر ستری بۆنەکرا بە مخالفە لەبەینی
دوو لای جلك جائزە واتە دروستە ( بەتەصریحی ئەم حەدیثەکەدێ ) ،

---

**١٣١ عن ابي هريرة (ض) من صلى في ثوب واحد فليخالف بين طرفيه ،**

( تەرجـــەمە )

١٣١ دەگێڕنەوە لەئەبوو هریرە فەرمووی پێغەمبەر (د) هەرکەسێك
نوێژبکا لەیەك پەشتەمالی ئیحرام ، با تەرەفی لای ڕاست بخاتە سەرشانی
چەپ ، تەرەفی لای چەپیش بخاتە سەر شانی ڕاست ، هەردوو سەریشی
لەسەر سنگی گرێ بدا ( ابن السکیت وای فەرموەە،بۆ تەصویری مخالفە)،

---

**١٣٢ عن جابر (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ما السرى ... يا جابر ، ما هذ الاشتمال الذي رأيت فان كان واسعا فالتحف به ، وان كان ضيقا فاتزر به ،**

( تەرجـــەمە )

١٣٢ دەگێڕنەوە لەجابر ــ ڕەزای خودای لێ بێ ــ لـە هەندێ

سەفەرانی • پێغەمبەر (د) لەخدمەتی دابووم • شـــەوێك بۆ كارێكی خۆم چوومە خدمەتی • دیتم نوێژی دەكرد • منیش یەك پەشـــتەمالم لەبەربوو • لەخۆم وەرگرت • لەتەنیشت ئەو نوێژم دابەســـت • وەكوو لەنوێژ بۆوە • فەرمووی ( ئەی جابر چۆنە بەم شەوە هاتی ) منیش كارەكەی خۆم ــ عــەرز كرد • وەكوو قسەم تەواوبوو فەرمووی ( ئەدی ئەو پەشتەمالەچییە دەیبینم )• بەم تەسكییە خستووتە سەرشانت گوتم پەشتەماڵە • فەرمووی •

( ئەگەر فرەوانە وەكوو عەبا بخە سەرشانت • ئەگــەر تەســـكیشە لەلای خوارێ وەربگرە ) وەستری عەورەتی پێ بكە •

---

**١٣٣ عن المغيرة (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم يا مغيرة • خذ الاداوة •**

**( تەرجـــەمە )**

١٣٣ دەگێڕنەوە لەموغیرەی كوڕی شوعبـــەڕەزای خودای لێبی• گوتی لەسەفەرێك لەخدمەت پێغەمبەر بووم (د) فەرمووی ئەی موغیرە بگرە ( زەرفی ئاو ) یەعنی بۆ سەرپێشاو گۆزە ئاوێكم بۆبێنە • ئنجا ڕۆیی تالەمن بزر بوو • لەپاش • تەواو بوونی پێشاو چووم ئاوم بەدەستی داكرد دەســـت نوێژی شووشت • قاچەكانیشی لەمەحس مەسحكرد نوێژی كرد •

---

**١٣٤ عن أنس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم الله أكبر • خربت خيبر • انا اذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرين • اذهب فخذ جارية • أدعوه خــذ جارية من السبي غيرها • من كان عنده شيء فليجيء به •**

## ( تەرجەمە )

١٣٤ دەگێڕنەوە لەئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) بەڕاستی پێغەمبەر (د) غەزای خەیبەری کرد • ئنجا نوێژی سبەینەمان لای ئەو کرد • لە ئەوەلی بەیان • ئنجا پێغەمبەر (د) سواربوو • ابو طەلحەش سواربوو • منیش لەپشت ئەبوو طەلحە سواربیبووم ئنجا پێغەمبەر بەسواری لەناو کۆلانی ـ خەیبەر گەڕا • فەرمووی ( خودا گەورەیە خەیبەر خراب بوو • ئێمە وەکوو دابەزین بەغەزا کردن • لەئەتراف قەومێك لەگاوران • بەدەسبەینەی کافران سێ جار ئەم قسەی دووبارە کردەوە • قەومەکەش هەرکەس بۆ سەر ئیشوکاری خۆیان چوون • گوتیان محمدو لەشکریەتی اختلاف لەگیرانی خەیبەر هەیە •

ئاایا بەصلح گیرا یابەشەڕ • منذری تەصمیمی کردووە • قسمێکی بەصلح • وەبەشێکی بەشەڕ بەشێکیش بەاجلاو دەرکردن گیرا • بەم قسەیە تەضاد لەبەینی ئاثار مندفع بوو ئەنەس لەم ڕیوایەتە دەڵێ بەشەڕ گرتمان ئنجا ئافرەتو مندال بەئەسارەت کۆ کرانەوە • دەحیە هات گوتی ئەی پێغەمبەری خودا • جاریەکم پێ بدە • فەرمووی ( بچۆ جاریەیێك ببە ) • چوو صەفیەی کچی یەحیای برد • پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خودا دەحیە کچی یەحیای برد کەسەرۆکی قورەیظەو نەضیرە بۆ تۆ نەبی بۆکەس • ناصولحێ ـ واتە هەر لەتۆ دەوەشێتەوە •

پێغەمبەر فەرمووی بیگێڕنەوە • بانگی کەن • وەکوو هات صەفیەشی لەگەل بوو پێغەمبەر (د) تەماشای کرد فەرمووی ( جاریەکی تر ببە ) ئنجا پێغەمبەر (د) ئازادی کرد • لەخۆی مارە کرد • ئازاد کردنەکەی بووە

مارەیی‌یەکەی ــ ئومی سولەیم لەڕێگا بۆی تەجهیز کردو بۆی گوێـزتەوە • فەخری عالەم (د) بوو بەزاوا • ئنجا فەرمووی ( هەرکەس شـتێکی لا هەیـە بابینی ) •ئنجا شتێکیان ڕاخست • پیاو هەبوو خورمای هینـا هەبوو ڕوونی هینا هەبوو پۆخینی هینا کرا بەخواردنو دەعوەت •

---

**١٣٥ عن عائشة رضي الله تعالى عنها • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اذهبوا بخميصتي هذهالى ابي جهم • وأتوني بابنجانية ابي جهم • فانها الهتني آنفا عن صـلاتي •**

**( تەرجـەمە )**

١٣٥ دەگێڕنـەوە لە حـەزرەتی عائشـــە ڕەزای خودای لێ‌بی کەپێغەمبەر (د) جارێك نوێژی کرد لەجلکەکی مورەبەعی نیشانەدار• بە جۆرە تەماشا کردنێك تەماشای نیشانەکانی دەکرد وەکوو لەنوێـژ بۆوە فەرمووی ( ئەم جلکە نیشانەدارە بۆ ئەبوو جەهم ببەن • جلکە ئەستوورە بێ‌نیشانەکەی ئەو بۆمن بینن چونکی ئەم نیشانەدارە بیری منی لەسەر نوێژ لابرد •

---

**١٣٦ عن أنس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم أمبطي عني قرامك • هـــنا • فانه لا تزال تصاويره تعرض لي في صلاتي •**

**( تەرجـەمە )**

١٣٦ دەگێڕنەوە لەئەنەس (ض) • حەزرەتی عائشە ڕەزای خودای

لێ بی • پەردەیەکی لەخوری ڕەنگاو ڕەنگ بەلایێکی خانووی خۆیدا شۆڕ کردبۆوە • پێغەمبەر (د) فەرمووی • ( ئـەم پەردەی ڕەنگاو ڕەنگت لابە • چونکی لەنوێژ صوردتەکانی خۆم بۆ دەنوێنن ) •

---

**١٣٧ عن عقبة (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم لا ينبغي هذا للمتقين •**

**( تەرجـەمە )**

١٣٧ دەگێڕنەوە لەعەقەبە ڕەزای خوای لێ بی • کە کوڕی عامر بوو • کەوایەکی نەخش کراو • بەدیاری بۆ پێغەمبەر (د) هاتبوو • لەبەر خۆی کردو نوێژی کرد وەکوو سەلامی دایەوە • بەتوندی لەبەر خۆی داڕنی فەرمووی ( لەبەر کردنی ئەم جۆرە کەوایە لەخواترسان ناوەشێتەوە ) • ( لایق نی‌یە بۆ ئەهلی تەقوا ) •

---

**١٣٨ عن أنس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قوموا فلا صلي لكم •**

**( تەرجـەمە )**

ق١٣٨ دەگێڕنەوە لە ئەنەس کوڕی مالك کە مولەیکـەی داپـیری • بۆخواردنێك دەعوەتی پێغەمبەری کرد (د) لە پاشی خواردن فەرمووی ( بـە ئیمامەتی نوێژێکتان بۆدەکەم • ئەنەس گوتی حەسـیرێکمان هـەبۆو • ڕەش داگەڕابوو • چونکی لەمێژبوو ڕاخرابوو نەختێکم ڕشـاند بەئـاو ڕامخست • پێغەمبەر هەلستا • من و هەتیوێك کـە ضمەیرەی کوڕی ئـەبوو

ضومەیری عەبدی پێغەمبەر بوو • صەفمان بەســــت وڕێزبووین پیرێژنیش کەئومی سولەیم بوو لەپاش ئێمە ڕاوەستا • دوو رکعەت نوێژی بۆ کردین • لەپاشان تەشریفی فەرموو • ( واتە ڕۆیشت ) •

---

**١٣٩ عن أنس (ض) قال • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • من صلى صلاتنا • واستقبل قبلتنـــا • وأكل ذبيحتنا • فذلك المسلم الذي له ذمة الله وذمة رسوله • فلا تخفروا الله في ذمته •**

**( تەرجـــمەمە )**

١٣٩ دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خودای لێ بێـــ گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) هەرکەسێك نوێژی ئێمە بکا • بەریش لە قیبلەی ئێمە بکاو گۆشتی دەستکوژی ئێمەبخوا • ئەمە مسلمانێکی وایە •

بۆ ئەو هەیە عەهد وامان لەتەرەف پێغەمبەری خودا • ئنجا خیـــانەت لەگەل خودا مەکەن بەخراپەکردن لەگەل ئەم نەوعە موسولمانە •

---

**١٤٠ عن ابن عباس رضي الله تعالى عنهما • قــال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم هذه القبلة •**

**( تەرجـــمەمە )**

١٤٠ دەگێڕنـــەوە لە ابنی عبــــاس ڕەزای خودای لێ بی وەکوو

ێغەمبەر (د) چووە ناو بەیت • دوعای کرد • لەهەموو لایەکو گۆشـەکانی•
وێژی تیانەکرد هەتا هاتە دەرێ • ئنجا دوو رکعەت نوێژی بەرەو کەعبەکرد•
ەرمووی ئەو کەعبەیە قیبلەیە •

---

## ١٤١ عن عبدالله ابن مسعود (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم وما ذاك • انه لو حـــدث في الصلوة شيء • لنبأتكم • ولكن انما انا بشر مثلكم أنسى كما تنسون • فانا نسيت • فذكروني واذا شك أحدكم في صلاته فليتحر الصواب •

### ( تەرجـەمە )

١١٤ دەگێڕنەوە لەعبداللهی کوڕی مەسعود ــ ڕەزای خوای لێ بێ•
وێژی کرد پێغەمبەر (د) ئنجا نازانم• لەمقداری نوێژ•زیاتری کرد یاکەمتری
کرد • وەکووسەلامی دایەوە عەرزکرا • ئەم نوێژە بۆچی وابوو ئایا لە وەحی
ت • فەرمووی بۆچی ( چی بووە ) • گوتیان نوێژەکەت لەسـەر غەیری
میقداری ئەصلی کرد • پێغەمبەر (د) بێ گفتو گۆ ڕووی پیرۆزی لەقیبلە
کرد • دووسەجدەی برد پاشان سەلامی داوە • پاشـــان ڕووی لەئێمەکرد
فەرمووی ( ئەگەر لەنوێژ شتێك واقع ببوایە لەلایەن خودا بەئێوەم دەگوت
بەلام منیش وەکوو ئێوە هەر ئینسانێکم چلۆن ئێوە شـت لەبیردەکەن منیش
لەبیردەکەم • ئنجا وەکوو لەبیرم چوو • بخەنەوە یادم • وە ئەگەر یەکێکتان
کەوتە شەك لەنوێژی خۆی • با اجتهاد بکا بۆجهەتی باش • پاشان لەسـەر

لایەباشەکی نوێژەکە تەواو بکا • پاشان سەلام بداتەوە پاشان دووسەجدە بەرێ ) • بۆ سەهوو لەبەر شکەکە • ڕیوایەتیش کراوە • ئەم نوێژە نوێژی نیوەڕۆ بوو بەسەهوو پێنج ڕکعەتی کردووە •

---

**١٤٢ عن أنس (ض) قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم ان أحدكم اذا قام في صلاته • فانه يناجي ربه • وان ربه بينه وبين القبلة فلا يبزقن احدكم قبل قبلته • ولكن عن يساره • او تحت قدمه • ثم اخذ طرف ردائه • فبصق فيه • ثم رد بعضه على بعض فقال أو يفعل هذا •**

**( تەرجەمە )**

١٤٢ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بێ کە پێغەمبەر (د) • دیتی چلمێك لەلای قیبلە زۆری پێناخۆش بوو • هەتا بەغایەتێك لەڕووی مبارەکی دەزاندرا • ئنجا خۆی هەلستا • بەدەستی پیرۆزی ڕنی • پاشان فەرمووی یەکێك لەئێوە وەکوو هەلستا بۆنوێژی خۆی ئەمە بەدزی گفتوگۆ لەگەل پەروەردەکەری خۆی دەکا • وە بەڕاستی پەروەردەکەری ئەو لەبەینی ئەو وەقیبلەی ئەوە ئنجا با تف ڕوو نەکا لەلای قیبلەی خۆی • بەلکی • لەلایی چەپی یاخۆ لەژێر قاچی ڕووبکا پاشان طەرەفێکی کراسی خۆت گرت • تفی پیرۆزی لەناو ڕووکرد • لایەکەی تری بەسەریەکدا داوە • فەرمووی ئێوەش وابکەن •

---

**١٤٣ عن أنس (ض) قال . قال رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم البزاق في المسجد خطيئة . وكفارتهـا دفنها .**

( تەرجـەمە )

١٤٣ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بێ گوتی . فەرمووی پێغەمبەر (د) تف ڕوو کردن لەمزگەوت. گوناهە . لابردنی ئـەم گوناهەش لابردنی نەکەیە . ئنجا چی بیشێری یەوە بەخۆلێك لەمزگەوت هەبێ. یـاخۆ فڕەی بدەی .

---

**١٤٤ عن ابي هريرة (ض) ان رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسـلم . قال هل ترون قبلتي ههنـا . فوالله مـا يخفى علي خشـوعكم ولا ركوعكم . اني لأراكم من وراء ظهري .**

( تەرجـەمە )

١٤٤ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە . ڕەزای خودای لێ بی بەراستی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەدی ئێوە وا ظەن دەبەن . کـەمن ڕووم لەقیبلەیەوە هەر جهەتی قیبلە دەبینم . ئەم ظـەنە مەبـەن قەسـەم بەخودا بـزرنی یە لەمن . نەترس و حضوری قەلبیتان . نە رکوعی ئاشکراتان . کـە لەنوێژدا پشتێشم لەئێوە دایە . دیتنی من موختەص (تایبەت) نی یە بەلای پێشەوە . بەبێ شکو گومان من ئێوە دەبینم لەلای پشـتەوەش بن . (ئەمـە یەکێکە لەخەصائصی پێغەمبەر (د) بۆ دیتنیش مەرج نی یە ڕوو بەڕوو بوونو موقابەلە

چونکە ئەمانە اموری عادینە • جائزە ادراکو هەست کردن بەم جۆرە کارانــە بەعەقل • بە اتفاقی جمهوری متکلمین و زاناکانی ئیسلام چونکی هەست کردن لەحەواس • بەم هێزانەیە کە خودا دای ناوە بە ئەمانــەت لــەم شــوێنانەی کەلەلەشدا هەیە • کەوایە جائزە بۆ خودا دایان بنی لەغەیری ئەم شــوێنانەش کەهەیە لای ئەهلی حەدیثیش دەلێن پێغەمبەر (د) لەبەینی دووشانی دووچــاو هەبوو وەکوو کونی دەرزی هەمووشتی پێ دەدیت لباسیش نەدەبووە مانعی دیتن • ( لەبەر ئەوە دەیانگوت پێغەمبەر لەپشتەوەش خەلکی دەدیت •

---

## ١٤٥ عن انس (ض) • قال النبي (ص) انثــروه في المسجد • وقال لعمه العباس • خذ • وقال له لا • لا • لا •

### ( تەرجــەمە )

١٤٥ دەگێرنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بێ گوتی زۆرتــرینی هەموو مالێك کەهاتبێ بۆ پێغەمبەر (د) • ئەو ماڵە بوو کەلە (بەحرەینەوە) بۆی هات فەرمووی ( لەمزگەوت ڕووکەن ) تەشــریفی بۆنوێژ چوو • ئــاوڕی لێ نەدایەوە • لەپاش نوێژ هات دانیشت هەرکەسی چاوی پێ کــەوت پێی بەخشی • لەناکاو حەزرەتی عەباسی مامی هات • گوتی یا رسول الله بەمنیش بدە من لمغەزای بەدر لەئەسارەت خۆم کڕیوە تەوە عوقــەیلی بــرازای خۆم کڕیوەتەوە • فەرمووی چەندی دەبەی بیبە • حەزرەتی عەباس ڕەزای خوای لێ بێ • جوالێکی پڕکرد • پاشان چوو هەلی بگری پێی هەل نەگیرا • گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەمر بەیەکێك بکە • بەپشتم دابدا • فەرمووی لا • واتە ( نا ) نالێم • گوتی تۆ بەکۆلمدابدە • فەرمووی • لا • هەنــدێکی لەماڵەکــە ڕووکردەوە پاشان چوو هەلی بگری • گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەمر بکــە

یەکێك بەکۆڵمدابدا فەرمووی : لا : ووتی تۆ بەکۆڵمدابدە فــەرمووی : لا :
هەندێکی تری ڕووکرد پاشان هەڵی گرت وە بەکۆڵی خۆی دادا • پاشـــــان
ڕۆیشت • پێغەمبەریش (د) • هەر تەماشای دەکرد هەتا لەپێش چاومـــــــان
بزربوو • لەبەر تەعەجوب لەحرصی مامی • ئنجا خۆی تەشرفی لەو جێگایە
هەڵنەستا هەتا پارەکە تەواو بوو یەك درهەم نەما •

---

**١٤٦ عن عتبان ابن مالك • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم سأفعل • انشاء الله اين تحب ان اصلي من بيتك • لا تقل ذلك الا تراه قد قال لا اله الا الله يريـــد بذلك وجه الله فان الله قد حرم على النار من قال لااله الا الله يبتغي بذالك وجـــه الله •**

( تەرجــەمە )

١٤٦ دەگێڕنەوە لەمەحموودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری • بەڕاستی
عیتبان کوڕی مالکی انصاری لە ئەصحابی بەدر بوو • هاتە خدمەت پێغەمبەر
(د) • گوتی ئەی پێغەمبەری خودا • چاوەکانم زەعیف بووە • منیش ئیمامەتی
بۆ قەومی خۆم دەکەم • وەکوو باران بباری ئەوشیوەی لەبەینی منو ئــەوان
هەیە بێ • پێیم ناکرێ بچمە مزگەوتی ئەوان • نوێژیان بۆبکەم • پێم خۆشــە
تەشریف بکەیە لام • نوێژێك لەماڵەکەی ئێمە بکەی • ئنجا ئــــەو جێگایــە
بکەمە جێگای نوێژ : پێغەمبەریش (د) فەرمووی باشە • (وادەکەم انشا الله) •
ئنجا پێغەمبەرو ئەبووبەکر بۆسبەینە وەکوو ڕۆژ بەرز بۆوە هاتن پێغەمبەر (د)
بۆ چوونە ژوورەوە ئیزنی خواست • ئیزنمدا دائەنیشت وەکوو هاتە ژوورێ •

پاشان فەرمووی ( لەکامە جێگایێکی خانوەکەت حەز دەکەی نوێژ بکەم )٠

منیش ئیشارەم کرد بۆ لایەکی خانوو پێغەمبەر (د) هەلستا ئێمەش هەلستاین ڕێزمان بەست دوو ڕکعەت نوێژی کرد ٠ ئێمەش لێ نەگەڕاین بڕواء ( خزیرە )مان بۆدروست کردبوو قامووس دەلێ وەکوو عەصیدە وایە لەگۆشتو ئارد دروست دەکرێ ٠ عالەمێکی زۆر لەئەهلی مەحەلە لەمالەکەماز کۆبۆوە ٠ یەکێك ووتی مالکی کوڕی دوخەیشن لەکوێیە ؟

یەکێکیش ووتی ئەمە منافقە ٠ خواو پێغەمبەری خۆش ناوێ ٠ پێغەمبەر (د)فەرمووی وامەلێ : تۆ نابینی گوتیتی لا اله الا الله ٠ مەقصودیشی زاتی خوابووە ٠ گوتی خواو پێغەمبەری خوا دەزانی ٠ ئێمە دەی بینین ٠ ڕووی لەمنافقاندایە پاشان پێغەمبەر (د) فەرمووی ٠

بەتەحقیقو بێشك خودا حەرامی کردووە لەئاگر هەرکەسی بلێ لا اله الا الله ٠

مەبەستیشی زاتی خودابێ عیوەزو غەرەزێکی تری نەبێ ٠

---

**١٤٧ عن عائشة (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ ان أولئك ٠ اذا كان فيهم الرجل الصالح ٠ فمات ٠ بنوا على قبره مسجدا٠وصوروا فيه ٠ تلك الصور فأولئك شرار الخلق عند الله يوم القيامة ٠**

( تەرجەمە )

١٤٧ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ــ ڕەزای خودای لێبی ٠ گوتی

ئومی حەبیبەو ئومی سەلەمە قسەیان لەکەنیسەیەك دەکرد ، لەحەبەشـــــە دیبوویان، چەند شکلو صورەتی تیابوو ، پاشان بۆپێغەمبەریش ئەم قسەیان گێڕاوە فەرمووی ئەوانەی وەکوو پیاوێکی باشیان تیاهەبێ پاشان وەفـات بکـــا ،

لەسەر قەبرەکەی مزگەوت بنابکەن ،

ئەم ڕەسمانەی تیا نەقش بکەن ،

ئەمانە ئەهلی شەڕو بەدکاری عالەمن لای خودا ، ڕۆژی قیامەت ،

---

**١٤٨ عن أنس (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ، يا بني النجــار ، تامنون بحائطكم هنا ، اللهم لا خير الا خير الاخرة ، فاغفر للانصار والمهاجرة ،**

**( تەرجــەمە )**

١٤٨ دەگێڕنەوە لەئەنەس ( ڕمزای خودای لێبێ ) گوتی پێغەمبەر (د) وەکووچووە مەدینە لەسەرەوەی شار لای قبیلەیەك ، دابەزی پێیـــان دەگۆترا ، ( بنو عمرو بن عوف ) چواردە شەو لای ئەوان بوو پاشان ناردیە شوێن خالوانەکانی کە قبیلەی بەنی نەجار بوون ئەوانیش چەکوو ئەسلحەیان لە خۆ قایم کردو هاتن ، بۆ خدمەتی ، پێغەمبەر (د) ، سواربوو لەووشتری خۆی ، وە ئەبووبەکریش لە پشتی خۆی ســوار کردبوو ، ئەشرافی بــەنی نەجاریش لەئەترافی بوون ، ڕۆیشتن هەتا بارگەی خۆی لەعەردێکی فرەوان لەپێش مالی ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری فڕەدا ، ئەحوالی پیرۆزیشی وابوو ،

حەزی دەکرد نوێژ بکا • لەهەر جێگایەك نوێژ بوو بایە •

نوێژی لەهەوێزی مەڕیش دەکرد • پاشان فەرمووی لەعەردەکەیشدا • هەندێ قەبری کافرانو هەندێ جێگای بەرزو هەندێ دارخورمای تیاهەبوو • ئنجا ئەمری فەرموو بەهەڵکەندنی قەبری کافران•وە شاردنەوەی ئێسقانیان •

وە ڕاست کردنەوەی جێگایەکانی بەرز وە بەبڕینی دارخورمایەکان •

وە ڕێز کردنی دارخورمایەکان لەلای قیبلەی مزگەوت • ئنجا ئەصحابی کیرام بە ئەشعار خوێندنەوە بەردیان دەکێشا بۆ مزگەوت •

پێغەمبەریش لەگەل ئەوان بوو دەی فەرموو (ئەی خودایا هیچ چاکەنی یە• چاکەی ڕۆژی دوایی نەبێ • مەغفیرەت بەئەصحاب بکە بەمەدینەو بەئەصحابی مەکە ) •

---

## ١٤٩ عن ابن عباس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • أريت النار • فلم أر منظرا كاليوم قط أفظع وفي رواية ابن عمر (ض) عرضت علي النار وانا أصلي •

( تەرجــەمە )

١٤٩ دەگێرنەوە لە ابنی عبــاس ڕەزای خودای لێبێ • گوتی ڕۆژ گیرابوو • پێغەمبەریش بەجەماعەتێکی زۆر گەورە • نوێژی کسوفی دەکرد• وەکوو لەنوێژ بۆوە• فەرمووی ئەی ئەصحاب لەم نوێژەمدا ئاگرم نیشاندرا• ئنجا نەم دیوە هیچ ــ نەزەر گاهێکی گەورەو بەڵـــــام وەکوو نەزەرگاهی ئیمرۆ بە شدەت •

**١٥٠ عن ابن عباس (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم . قال لعنة الله على اليهود . والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد .**

( تەرجـەمە )

١٥٠ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشەو ابنی عەباس ڕەزای خودایان لێ بێ . وەکوو پێغەمبەر (د) هاتە سەر وەفات . چەورە پێکی ڕەنگداری بەدەستەوەبوو . هەر جارە بەڕوویی مبارەکی خۆیدا دەدا . وەکوو گەرمیشی کردایە لەسەر ڕوویی خۆی فڕە دەدا . لەم ئەحوالەدابوو . فەرمووی لەعنەتی خوا لەسەر جوولەکەو دیانبێ . مەرقەدی پێغەمبەرەکانی خۆیان گێڕاوە بەمزگەوت . ( یەعنی لەپاش وەفاتیمن ئێوەیش . وەکوو ئەوان نەکەن نوێژ بەمقابلی قەبری ئەنبیاو صلحا شبهی شرکە ) .

---

**١٥١ عن ابن عمر (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم . أجعلوا في بيوتكم . من صلوتكم ولا تتخذوها قبورا .**

( تەرجـەمە )

١٦١ دەگێڕنەوە لە ابنی عمر ڕەزای خودای لێبێ فەرمووی پێغەمبەر (د) . مەنێن لەنوێژەکانی خۆتان کە نەوافیلن . لەخانوەکانی خۆتان بکەن . بەکوللی خانوەکانتان . وەکوو قەبرستان خالی مەکەن لەنوێژ .

---

## ١٥٢ عن سهل ابن سعد (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • اين ابن عمك • انظر اين هو • قم ابـــا تراب قم ابا تراب •

( تەرجـــەمە )

١٥٢ لەسەهل کوڕی ســـــەعد ڕەزای خودای لێ‌بی دەگێڕنەوە • گوتی پێغەمبەر (د) هاتەمالی فاطمە • چاوی بەعەلی نەکـــەوت • فـــەرمووی ( ئامۆزات لەکوێ‌یە ) • گوتی کەمێك ناخۆشیمان لەبەینی پەیدابوو • ئەویش زیزبوو ڕۆیشتە دەرێ قەیلولەتی لای من نەکرد • ( قەیلولەت واتە خەوێکی کەم لەکاتی نیوەڕۆ ) • ئنجا ڕاوی کەسەهلە گوتی • پێغەمبەر (د)• ئەمـــری بەمن کرد (بزانە لەکوێ‌یە)• منیش هاتمەوە عەرزم‌کرد • لەمزگەوت ڕاکشاوە• ئنجا پێغەمبەر (د) تەشریفی بۆلای چوو • دیتی عەبایەکــــەی لەطەرەفێکی کەوتووە قالبی بەتۆز بووە • ئنجا پێغەمبەر (د) تۆزی لێ‌دەتەکـــاند • دەی فەرموو • ( هەستە خۆلاوی • هەستە خۆلاوی ) ( ئەم حەدیثە موشعیربوو • بەجەوازی خەو لەمزگەوت • وبەجەوازی تەکنیـــە بەغـــەیری ئـــەولاد • وە بەتەوابی مولاطەفەی زاوایان ) •

---

## ١٥٣ عن أبي قتادە (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال • اذا دخل احـــدكم المســـجد فليركع ركعتين قبل ان يجلس •

( تەرجـــەمە )

١٥٣ دەگێڕنەوە لەقەتادەی ســـولەمی ــ ڕەزای خودای لێ‌بی •

ڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو یەکێك لەئێوە چووە مزگەوت بادوو ڕکعەت نوێژ بکا لەپێش دانیشتن (هەرچوار مەزهەب (واتە شافعی و حەنەفی و مالکی و حەنبەلی) بەم حەدیثە کاردەکەن • بەلام ئیمامی حەنەفی دەلێ نابی لەوەقتی کەڕاهەت بیکا) •

---

## ١٥٤ عن ابی سعید الخدري (ض) قال النبي صلی الله تعالی علیه وسلم • ویح عمار تقتله الفئة الباغیة یدعوهم الی الجنة ویدعونه الی النار •

( تەرجەمە )

١٥٤ دەگێرنەوە • ڕۆژێك ئەبوو سەعیدی خدری ــ حەدیثی دەخوێندەوە • هەتا هاتە سەر باسی دروست کردنی مزگەوت • گوتی هەر یەکێك لەئێمە یەك خشتی هەلدەگرت عەمار دوو دوو هەلی دەگرت • پێغەمبەر (د) • چاوی پێ کەوت • بەجیهەتی لاواندنەوەو دلپێسووتان فەرمووی ئەسەف بۆ عەمار جەماعەتێکی زالم شەهیدی دەکەن • کەدەعوەتیان دەکا بۆ بەهەشت • ئەوانیش دەعوەتی عەمار دەکەن بۆئاگر • (ئنجا ئەصحابی معاویە ڕەزای خودای لێبی لەشەڕی صفین شەهیدیان کرد • چونکی دەعوەتی ئەوانی دەکرد • بۆسەبەبی بەهەشت • کە اطاعەی حەزرەتی عەلی بوو • امامێکی واشبوو کەواجب الطاعەبوو • ئەو وەقتە ئەوانیش دەعوەتی ئەویان دەکرد • بۆ ئاگر • بەلام مەعذور بوون چونکی مجتهدبوون ظەنیان وابوو بۆ بەهەشت داوەتی دەکەن ئنجا ئەگەرچی لەنەفس الامردا بەهەلەچووبون چی جایی کەگوناهکار بووبن بەلکی ئەجریکیشیان

(پاداشت) هەبوو چونکی مجتهد ئەگەر ئیصابەت بکا دوو ئەجری هەیە • ئەگەر بەهەڵە بچی ئەجرێکی هەیە ) • ( ئەمە لەقەسطەلانی وادەڵێ ) •

---

## ١٥٥ عن عثمان رضي الله تعالى عنه • قال اني سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول من بنى مسجداً يبغي به وجه الله بنى الله له مثله في الجنة •

( تەرجەمە )

١٥٥ دەگێڕنەوە لەعوسمانی کوڕی عەففان ڕەزای خودای لێ بی • وەکوو مزگەوتی پێغەمبەری دروست کرد • لەبەردی نەخش کراو • گوتی ئێوە لەقسەی دروست کردنی مزگەوت زۆر درێژەتان داین منخۆم بیستم لەپێغەمبەر (د) •هەرکەسێك دروست بکا مزگەوتێك مەبەستیشی تەنیا یۆزاتی خوابی • خودا دروست دەکا بۆئەو مثلی مزگەوتەکەی لە بەهەشت •

( مراد لەمثلیەت • مقدارو فرەوانی نی‌یە چونکی ئیمامی ئەحمەد بەمەرفوعی ریوایەتی کردووە ( من بنی مسجدا بنی الله له بیتا اوسع منه ) • مرادی خودا بۆی دروست دەکا مثلیبیناى ئەو بە ارجاعی ضمیری متصل بەمثل وەبال بناى مستفاد لە ( بنی ) نەك وەبال مسجد • ئنجا بەدەلیلی منجاء بالحسنه فله عشر امثالها اقلا ــ لای کەمی • دە ئەوەندەی مزگەوتەکەی بۆ دروست دەکرێ •

تۆیەکەی تر لەگەورەیی و چاکەی خودایە لازمیش ناکا لەئەصلی بنا وەکوو یەك بن لەفرەوانی و جوانی و زۆرو کەمیش وەکوو یەکتری بن ) •

بەلکی عوض ( وانە تۆلە ) لەهەموو لایەتێك دەبی بالآتربی لەوەی کەلەبـاتی دەدرێ ( معوض عنە ) ٠

---

**١٥٦ عن جابر (ض)عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم انه قال ٠ من مر في شيءمن مساجدنا أو أسواقنا ننبل فليأخذ على نصالها لا يعقر بكفه مسلما ٠**

( تەرجـەمە )

١٥٦ دەگێڕنەوە لەئەبوو موسی (ض) ئەویش لەپێغەمبـەر (د) ٠ فەرمووی هەرکەسێك ڕەت بیی لەمزگەوتەکانی ئێمـــە ٠ وەلە جێگایەکانی کۆبوونەوەی ئێمە ٠

بەسەرە تیرو بەسەرە ڕمەوە ٠ باپارێزگاری سەرەکان بکەن ٠ بەگرتن و داپۆشین یا برینداری نەکا دەستی خۆی موسولمانێك ٠

---

**١٥٧ عن جابر قال النبي (ص) امسك بنصالها ٠**

( تەرجـەمە )

١٥٧ دەگێـڕنەوە لەجـابر ڕەزای خودای لێبی گوتی پیـاوێك بەمزگەوتدا ڕەسـت بوو چەنـد تیرێکی پێبوو پێغـەمبەر (د) فەرمووی سەرەتیرەکانت بگرەو دایانپۆشە نەوەك زەرەر بەلەش بگەینن یابـە لبـاسی کەسێك بگەینن ٠

---

١٥٨ عن حسان ابن ثابت (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • يا حسان أجب عن رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اللهم ايده بروح القدس •

( تەرجـەمە )

١٥٨ دەگێڕنەوە لەحەسـانی کوڕی ثـابت ڕەزای خودای لێ بێ• داوای کرد لەئەبوو هورەیرە • کەشاهیدی بۆبـدا پێی گوت • توو خودا تۆیستت لەپێغەمبـەری خودا ،ەی گوت حەسان لەجیاتی پێغەمبەری خودا جوابی هەجوی کافران بدەوە • یارەبی تەئییدو تەقویەی حەسـان بکـەی بەڕوح القدس کەجبرائیلە ئەبوو هورەیرە گوتی هارێ •

ئەم قسـەم لەپێغەمبەر بیست •

---

١٥٩ عن كعب ابن مالك (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يا كعب ضع من دينك هذا • قم فاقضه •

( تەرجـەمە )

١٥٩ دەگێڕنەوە لەکـەعبی کوڕی مـالك ڕەزای خودای لێ بێ • کەهەندێ قەردی لەسەر کوڕی ئەبوو حەدرەدهـ بوو •

لەمزگەوت داوای لێ کرد • دەنگیان بـەرز بۆوە • بەغـایەتێك پێغەمبەر (د) لەمالێ گوێی لێ بوو تەشریفی وابەتوندی هاتە دەرێ • پەردەی دەرگەی حوجرەی خۆی لابرد •

بانگی فەرموو (ئەی کەعب)• گوتی بەڵێ قوربان ڕاوەستاووم لەخدمەت فەرمووی • ( لەنیوەی قەردەکەت خۆشبە ) گوتی ئەوا لێخۆشبووم ئـەی پێغەمبەری خودا • فەرمووی بەکوڕی حەدرەد • ( هەڵستە نیوەکەی تری پێبدە ) •

---

**١٦٠ عن ابي هريرة (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسـلم • أفلا كنتم اذنتموني به دلوني على قبره• أو على قبرها •**

**( تەرجـەمە )**

١٦٠ دەگێـڕنەوە لـە ابی هـریـره ـ ڕەزای خـودای لێبی گوتی پیـاوێکی ڕەش • یـاخۆ ژنێکی ڕەش • هـەبوو مزگـەوتی دەمـالی وەفـاتی کـرد • پێغـەمبەر ( د ) سـؤالی لێکـرد عەرزیـان کرد مرد • فەرمووی ئنجـا بۆچی خەبەرتـان بەمن نەدا • وەرن قەبرەکەم نیشاندەن ئنجا بۆسەر قەبرەکەی چوو • نوێژی لەسەر کرد •

---

**١٦١ عن أبي هريرة (ض) • ان النبي صلى الله عليه وسلم قال ان عفريتا من الجن تفلت علي البارحة • ليقطع علي الصلاة فأمكنني الله منه • فاردت ان أربطه الى سارية من سواري المسجد • حتى تصبحوا و تنظروا اليه كلكم • فذكرت قول أخي سليمان • رب اغفر لي وهب لي ملكا لا ينبغي لاحد من بعدي •**

( تەرجـەمە )

١٦١ دەگێـــڕنەوە لەئەبوو هوڕەیـرە ــ ڕەزای خودای لێ بێ کەپێغەمبەر (د) • فەرمووی بەڕاستی عیفرتێك لەجنی دوێنێ شەو بەچوستی تەعروزی بەمن کرد کە نوێژم ببڕێ • پاشان خودا موســـەخەری من کــرد عیفریتەکە ئیرادەم کرد•لەئەستوونەیەك لەئەستوونەکانی مزگەوتی ببەستمەوە هەتا سبەینە • کەهەموتان تەماشای بکەن پاشان دوعای سولەیمانی بــرای خۆم کەوتەوە یاد • کەگوتی یارەبی لێم خۆشبی • هێزو دەسەلاتێکی واشــم پێ بدەی • کەنەگونجی بۆهیچ یەکێك لەپاش خۆم ( یەکێك لەسەلطەنەتەکانی ئەویش تەسخیری شەیتانەکان بوو • ئنجا ئەگــەر منیش وام لەعفریتــەکە بکردایە • لازم دەهات خودا دوعای ئەوی قبوول نەکردبێ • لەبەر ئەمە نەم بەستەوە •

---

## ١٦٢ عن ام سلمة (ض) قال رســول الله صلى الله تعالى عليه وسلم طوفي من وراء الناس • وانت راكبة •

( تەرجـەمە )

١٦٢ دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران هیندی کچی ئەبی ئومەیە • بەئومی سەلەمە مەشهوور بوو گوتی عەرزی پێغەمبەرم کرد (د) ناساغم ئازارم هەیە • فەرمووی بە سواری لەپاش خەلکی طەوافی کەعبە بکە •

١٦٣ عن ابی سعید (ض) قال رسول الله صلی الله تعالی علیه وسلم . ان الله سبحانه خیّر عبدا بین الدنیاوبین ما عنده . فاختار ما عند الله یا ابا بکر لا تبك ان أمن الناس علي في صحبته . وما له ابو بکر ولو کنت متخذا من أمتي خلیلا . لاتخذت ابا بکر ولکن أخوة الاسلام . ومودته لایبقین في المسجد باب الا سدّ . الا باب أبي بکر .

( تەرجەمە )

١٦٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بێ . پێغەمبەر (د) لە خوطبەدا فەرمووی . خودا دلخوازی کرد عەبدێك لەبەینی دونیاو لەبەینی ئەوی لای خۆی هەیە . اختیاری کرد ئەوی لای خودا هەیە . ئەبووبکر ڕەزای خودای لێ بێ گریا لەدلی خۆم گوتم ئەم زاتە محترەمە بۆچی دەگرێ نەمزانی مەبەستی پێغەمبەر کۆچ کردنیتی لەدونیا .

ئەبووبکر لەئێمە زاناتر بوو تێ گەیشت پاشان پێغەمبەر (د) .فەرمووی ئەی ئەبووبکر مەگرێ . بەڕاستی سەخی ترینی خەلکی بەڕووحی خۆی و بەمالی خۆی لای من لەمودەی صوحبەتی خۆیدا ئەبووبکرە . وە ئەگەر من یەکێك لەئومەتی خۆم بگیرابوایە بەدۆستێکی شەخصی.ئەبووبکرم دەگیرا بەدۆست . بەلام لەبەینی ئێمە تەنیا برایەتی یەکی دینی و صوحبەتێکی دینی هەیە .وەبادەرگەکانی مزگەوتیش هەموو پێوە بدرێ دەرگەی ئەبووبکر نەبێ لەم قسەیەدا ئیشارەتێك هەیە بۆ خەلافەتی . واتە ( بوونەجێگری پێغەمبەر (د) .

١٦٤ عن ابن عباس رضي الله عنهما ٠

قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ انه ليس من الناس احد أمَنّ علي في نفسه ومالـه من ابي بكر ابن ابي قحافة ٠ لو كنت متخذا من الناس خليلا ٠ لاتخذت أبا بكر ولكن خلة الاسلام أفضل سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد غير خوخة أبي بكر ٠

( تەرجەمە )

١٦٤ دەگێڕنەوە لە ابنی عباس ڕەزای خودای لێ بێ گوتی هاتە دەرێ بۆ مزگەوت پێغەمبەری خودا (د) لەناساغی وەفاتیدا پەڕۆیەکی لەسەری پێرۆزی بەستبوو دانیشت لەسەر مینبەر ٠ حەمدوثەنای خودای کرد ٠ پاشان فەرمووی ٠ نییە لەخەلکی یەکێك ٠ سەخی تربێ بەڕووحی خۆی وە مالی خۆی دەرحەق بەمن لە ئەبووبکری کوڕی عثمانی ناسراو بە ابوقوحافە ئەگەر کەسێکم بکردایە دۆستێکی تایبەتی ئەبووبەکرم دەکردە دۆستی خۆم ٠ بەلام دۆستایەتی دینی ئیسلام گەورەترە ٠ هەموو دەرگە بچووکەکانی ئەم مزگەوتە پێوە بدەن ٠ دەرگە بچووکی ئەبووبکر نەبێ ٠ ( لەداخستنی دەرگەکانی غەیری ئەبوبکرو هێشتنەوەی دەرگەی ئەبووبەکر ئیشارە هەیە بۆ خەلافەتی٠

---

١٦٥ عن ابن عمر رضي الله تعالى عنهما ٠ قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ مثنى مثنى ٠ فاذا خشي الصبح صلى واحدة فأوترت له ما صلى ٠

( تەرجـەمە )

١٦٥ دەگێڕنەوە لەابنی عمر ــ ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر لەسەر مینبەربوو (د) • پیاوێك دەرحەق بەشەو نوێژ پرسیاری کرد فەرمووی شەونوێژ دوو رکعت دوو رکعەت دەکرێ • ( ئەگەر کەسێکیش عادەتی بی وتر لەپاش تەهەجود بکا ) • بشترسێ • لەوەی کە بەیانی بدا • بایەك ڕکعەت وتر لەپاش نوێژەکانی تەهەجود بکا • شافعیەکان بەلگەیان ئەمەیە کەمترین وتر (یەك رکعەتە ) •

---

**١٦٦ عن ابي هريرة (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال صلوة الجميع تزيــد على صلاته في بيتـــه وصلاته في سوقه خمسا وعشرين درجة فان احدكم • اذا توضا فاحسن الوضوء واتى المسجد لا يريد • الا الصلوة • لم يخط خطوة الا رفعه الله بها درجة • وحط عنه بها خطيئــة • حتى يدخل المسجد فاذا دخل المسجد كان في صلوة ما كانت تحبسه وتصلي الملائكة عليه ما دام في مجلســه الذي يصلي فيــه • اللهم اغفر له اللهم ارحمه ما لم يحدث فيه •**

( تەرجـەمە )

١٦٦ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ــ ڕەزای خودای لێ بی • ئەویش لەپێغەمبەر (د) • فەرمووی نوێژی بەجەماعەت بیست و پێنج مەرتەبەی زیاترە لەنوێژێك لەماڵ بکری ولەنوێژێك لەبازارو کۆلانو مەحەلە بکرێ چونکی

بەڕاستی یەکێك لەئێوە وەکوو دەستنوێژی شووشت بەهەموو مەرجەکانی یەوە ، وە بۆمزگەوتیش بێ غەیری نوێژیش هیچ مەبەستێکی تری نەبێ بەهەر هەنگاوێك خودا دەرەجەیێکی بەرزی پێ دەدا ، وە گوناهێکی لەسەر لادەبا هەتا دەچێتە ناو مزگەوت ، پاشان وەکوو چووە ناو مزگەوت، ئەمە لەنوێژدایە مادام لەبەر نوێژ گیربووبێ ، مەلائکەیش داوای لێبوردنی بۆدەکەن هەتا لەوجێگایە دانیشتبێ کەنوێژی لێدەکا ، مەلائکە دەلێن ئەی خودایا گوناهی داپۆشە ، ئەی خودایا ڕەحمی پێ بکە ، مادام بێدەستنوێژ نەبووبێ ،

---

## ١٦٧ عن ابي موسى (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال ان المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا وشبك اصابعه .

( تەرجەمە )

١٦٧ دەگێڕنەوە لەئەبوو موسى ( ڕەزای خودای ) لێبی ئەویش لەپێغەمبەر (د) فەرمووی بەبێ گومان ، ئیماندار بۆ ئیماندار وەکوو بیناو دیوارە ، توندو مەحکەم دەکا ، هەندێك هەندێکی تر ، وە ئەنگوستی دەستەکانی پیرۆزی خستە ناو یەکتری وەکوو پەنجەرە ،

یەعنی چلۆن هەر بەشێك لەبەشەکانی دیوار یەکتریان گرتووە ، ئیمانداریش بەهۆی یەکیەتی باوەڕیو ئیمان ، یەکتریان گرتووە ،

## ١٦٨ عن ابي هريرة (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . لم أنس . ولم تقصر . فقال أكما قال ذو اليدين .

( تەرجــەمە )

١٦٨ دەگێـڕنەوە لەئـەبوو هورەیـرە . ڕەزای خودای لێ بێ . پێغەمبەر (د) یەك لەدوو نوێژی مەغرب وعیشای بەئێمە کرد . لەدوو رکعەت سەلامی دایەوە . پاشان دارێك لەلایەکی مزگـەوت کـەوتبوو . چوو پاڵی بەدارەکەدا . وەکوو ڕقی ببیتەوە وابوو .

دەستی ڕاستیش لەسەر دەستی چەپی دانا . ئەنگوستەکانیشی تێـك پەڕاند . لاڕوومەتی ڕاستی لەسەرپشتی دەستی دانا . چەند کەسێك زوو لەمزگەوت چوونە ــ دەرێ . گوتیان نوێژ کورت کراوەتەوە . ئەبوو بەکرو عومەریش لەناو قەوم بوون . لەبەر سەرسامی نەیان توانی قسەبکەن لەگەل پێغەمبەر (د) . پیاوێك پێیان دەگوت ذو الیدین ــ ناوی ( خـرباق ) بوو . بۆیە پێیان دەگوت ذو الیدین چونکی دەستەکانی درێژ بوون . عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا . لەبیرت چوو . یاخۆ نوێژ کورت کـراوەتەوە . فەرمووی لەبیریشم نەکرد . کورتیش نەکـراوەتەوە پاشـان فـەرمووی ئەرێ قسەی ذو الیدین ڕاستە . گوتیان ( بەڵی ) : ئنجا پێغەمبەر پێشکەوت . ئەومقداری لەنوێژ تەرك کرابوو ــ کردی یەومو سەجدەی سـەهوی برد . ئەم حەدیثە پیرۆزە چەند موشکیلات هەیە . پێویستە بەیان بکرێ . ئەگـەر بەئیعتراز بگوترێ . چلۆن دروستە لەپاش سەلامدانەوەی نوێـژ . قسـەی بەاختیاری بکرێ . نەك بەسەهوو لەبیرچوون . دوو ڕکعەتی تریش بکرێ .

ئایا بەسەجدەی سەهویش نوێژەکەی دروستە • چونکی قسەکان بەسەهوو نەبووە •

(جەواب) : لەم حەدیثە پیرۆزە ئیمامەکانی مجتهد اختلافیان بووە : لای ئیمامی ئەعزەم ابو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ • گوتێ حوکمی ئەم حەدیثە لە خەصائصی پێغەمبەرایەتی‌یە• لەسەر فەرموودەی ئەو بەقسەی دونیە لەپاش سەلام بۆ پێغەمبەر باش بووە • بۆ ئێمەش نوێژ بەتاڵ دەبێ •

لای ئیمامی شافعی : (کلام ناس کلام الناسی) بێ نوێژ بەتاڵ نابێ • یەعنی کەسێك لەنوێژدابێ واتێ بگا لەنوێژدا نی‌یە قسەی دونیابکا نوێژی بەتاڵ‌نابێ پێغەمبەریش کەقسەی بەاختیار کردووە بەم ظەنە بووە کەلەنوێژدانی‌یە •

لای ئیمامی مالکیش ــ رەحمەتی خوای لێبێ • قسە ئەگەر بۆ اصلاحی نوێژبێ نوێژ بەتاڵ ناکا •

---

**١٦٩ عن ابي سعيد (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم اذا صلى احدكم الى شيء • يستره من الناس • فأراد احد ان يجتاز بين يديه فليدفعه فأن أبى فليقاتله فانما هو شيطان •**

**( تەرجەمە )**

١٦٩ دەگێڕنەوە لەئەبوسەعید • ڕەزای خودای لێبێ • پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو نوێژی کرد یەکێك لەئێوە • بەری لەشتێکی واش‌کرد دەی پارازت لەڕێبواران • پاشان یەکێکیش ئیرادەی‌کرد بەپێشی‌دا

ڕەت بیێ • یەعنی بکەوێتە بەینی شوێنی نوێژو ( سترە ) • بابەئیشارەیێکی سووکیش بی • لێ نەگەڕێ بەپێش‌دا ڕەت بی • پاشان ئەگەر نەگەڕاوە لەڕەت بوون • باکوشتاری لەگەل بکا بێشك ئەمە شەیتانێکە لەئینسان •

---

**١٧٠ عن ابي جهيم (ض) • قال : قال رســـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • لو يعلم المار بين يدي المصلي ماذا عليه من الاثم • لكان أن يقف اربعين خيرا له من ان يمر بين يديه •**

**( تەرجـــەمە )**

١٧٠ دەگێڕنەوە لەئەبوو جوهەیم • ڕەزای خودای لێ بی • ووتی پێغەمبەر (د) فەرمووی • ئەوکەسەی کەفکری وایە بەپێش یەکێك ڕەت بیی کەلەنوێژدایە • بزانی چی گوناهێکی‌هەیە • پێی خۆشترە ڕابوەستێ چـــل نەك بەپێشی‌دا ڕەت بی ڕاوی دەلێ یەقینم کرد فەرمووی چل‌بەلام ژمراوەکەم لەبیرچوو نازانم فەرمووی چل ڕۆژ • یامانگ • یا سالّ •

## كتاب مواقيت الصلوة

## ( باسی کاتەکانی نوێژ )

بســم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

**١٧١ عن أبي مسعود (ض) ، عن رســول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ، قال جبرائيل بهــذا أمرت ، أي ان اصلي بك خمس صلوات ،**

( تەرجــەمە )

١٧١ دەگێڕنەوە لەئەبوو مەسعودی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بێ ڕۆژێك چووەلای موغیرەی کوڕی شوعبە لەکوفە ، کرابووە ئەمیر ، لەلایەن مەعاویە ، نوێژی تەئخیر کردبوو ، پێی گوت ئەی موغیرە ، ئــەمــە چیە نوێژت تەئخیر کردووە نۆقەت نەتزانی ، جبرائیل هاتە خوارێ نوێژی کرد ، پێغەمبەریش نوێژی کرد پاشان نوێژی کرد ، پاشان نوێژی کرد پێغەمبەریش نوێژی کرد ، پاشان نوێژی کرد پێغەمبەریش نوێژی کرد ، پاشان نوێژی کرد

یغەمبەریش نوێژی کرد • پاشان جوبرائیل گوتی • بەمە لەلایەن خودا
. ەمنم پێ کراوە کەنوێژت پێ بکەم • وپێت ڕابگەیەنم •

---

**١٧٢ عن حذيفة (ض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم فتنة الرجل في اهله وماله • وولده • وجاره تكفرها الصلوة والصوم والصدقة والامر والنهي •**

**( تەرجـەمە )**

١٧٢ دەگێڕنەوە لەحوذەیفـە ( ڕەزای خودای لێ بێ ) فـەرمووی پێغەمبەر (د) • گرفتار بوونی پیاو بەگوناه •. بەسـەبەب کـەس و کاری و سەبەب مالی ومندالی و جیرانی • نوێژو ڕۆژوو صەدەقەو ئەمربەچاکەو نەهی خرابەی ئەم پیاوە گوناهەکە دادەپۆشی • ڕووی ئاشکرای ئەم حەدیثـە گونەهی گەورەوگچکە دەگرێتەوە • بەلام زاناکان دەلێن مەبەست گونـاهی چووکەو بەس •

---

**١٧٣ عن ابن مسعود (ض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • لجميع امتي كلهم •**

**( تەرجـەمە )**

١٧٣ دەگێڕنەوە لەابنی مەسعود ــ ڕەزای خودای لێ بێ • پیاوێك فرەتێکی ماچ کردەهاتە خدمەت پێغەمبەر (د) • خەبەری پێدا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارێ (اقم الصلوة طرفی النهار وزلفا من الليل ان الحسنات يذهبن السيئات ) •

پیاوەکە وەوتی یا رسول الله ئەمەهەر بۆمنە فەرمووی ( بۆهەموو ئومەتی منەبەتەواوی ) ٠

---

## ١٧٤ عن ابن مسعود (ض) ٠ ــقال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ الصلوة على وقتها ٠ ثم بــر الوالدين ٠ ثم الجهاد في سبيل الله ٠

( تەرجــەمە )

١٧٤ دەگێرنەوە لەابنی مسعود ( ڕەزای خودای لێبی ) گوتی پرسیم لەپێغەمبەر (د) چی کارێك خۆشەویست ترە لای خودا ٠ فــەرمووی نوێــژ لەکاتی خۆیدا ٠ گوتم پاشان چی‌تر فەرمووی چاکە دەرحــەق دایك‌وباوك ٠ ووتم پاشان چی‌تر ٠ فەرمووی غەزا لەڕێی سەرکەوتنی خودا ٠

---

## ١٧٥ عن ابي هريرة رضي الله عنه انه سمع النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ يقول أرأيتم لو ان نهرا ببــاب احــدكم يغتسل فيــه كل يوم خمسا ما تقول ذلك يبقي من درنه قال فنلك مثل الصلوة الخمس يمحو الله بها الخطايا ٠

( تەرجــەمە )

١٧٥ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە ٠ ڕەزای خودای لێبی بەڕاستی بیستی لەپێغەمبەر (د) ٠ دەی فەرموو ئەرێ خۆ دیتتان ٠ یەعنی خەبەرم بدەنێ ئەگەر بەڕاستی ڕووبارێك ٠ لەدەرگەی خانووی یەکێکتان هەبی ٠ خۆی لەو

ڕووباره بشوا هەموو ڕۆژێ پێنج جار ، ناڵێی تۆ ئەمە چلك دەهێلیتەوە ،
ئەصحاب گوتیان هیچ شتێك لەچلك ناهێلیتەوە ) ، فەرمووی دەنا ئـــەم
ڕووبارو خۆشووشتنە وەکوو پێنج نوێژی فەرزە ، خودا بەم نوێژانە، هەموو
گوناهن ، دەسڕیتەوەو دەشواتەوە ،

---

**١٧٦ عن انس (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم اعتدلوا في السجود،ولا يبسط ذراعيه كالكلب ، فاذا بزق فلا يبزقن بين يديه ولا عن يمينه ، فانما يناجي ربه ،**

**( تەرجــەمە )**

١٧٦ دەگێڕنەوە لەئەنەس ، ڕەزای خودای لێبی پێغەمبەر ( د ) ،
فەرمووی ، سەجدە باش بیەن ، باباسکەکانی ، بلند ڕاگــری لەسەرعەرد ،
وەکوو سەگ لە سەر عەرد هەتا هەنیشك درێژیان نەکا ، پاشـــان وەکوو تفی
ڕووکرد تف ڕوونەکا لەپێش خۆی ، لــەلای ڕاستیشی ڕوو نەکا چونــکی
بەتەحقیق ئەوکەسەی نوێژ دەکا گفتوگۆ لەگەل خودا دەکا .

---

**١٧٧ عن أبي هريرة (ض) ، قال رســـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ، اذا اشتد الحر فابـــردوا بالصلواة ، فان شدة الحر من فيح جهنم ، واشـــتكت النار الى ربهـــا فقالت رب اكل بعضي بعضا ، فاذن لها بنفسين ، نفس في الشتاء ونفس في الصيف اشد ما تجدون من الحر ، واشد ما تجدون من الزمهرير ،**

( تەرجــەمە )

١٧٧ دەگێــڕنەوە لەئــەبوو هورەیــرە ، ڕەزای خودای لێ بێ . پێغەمبەر (د) فەرمووی لە هاوین ، لەوەقتی نوێژی نیوەڕۆ وەکوو گەرمــشیەنی کرد ، کەمێك نوێژی نیوەڕۆ دوابخەن ، هەتا کەمێك فێنك دادێ . چونکی شنەتی گەرما لە هەناسەی جەهەنەمە ، ئاگر شکایەتی پێش خــالقی خۆی کرد ، گوتی ئەی خالق من هەندێکم هــەندێکی خوارد ، ئنجــا خودێزنی دا ، دووپشی هەلکێشی ، پشێك لەزســـــتان پشوویەکی تر لەهاوین سەخت ترینی گەرمایەکی کەئێوە هەست دەکەن لەنەفەسی هاوینی جەهەنەمە. سەخت ترینی ساردی یەکی کەحس دەکەن لە زستان لەنەفەسی زســــــتانی جەهەنەمە ( ئەی ارحم الراحمین بمانپارێزی لەساردو گەرمی جەهەنەم ) .

---

**١٧٨ عن ابي ذر (ض) . قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم . أبرد أبرد ان شدة الحر من فيح جهنم فــــاذا اشتد الحر فابردوا بالصلوة .**

( تەرجــەمە )

١٧٨ دەگێڕنەوە لەئەبوو ذەری غەفــــاری ڕەزای خودای لێ بێ . ووتی لەسەفەرێك لەخدمەت پێغەمبەر بووین (د) بانگدەر ( مؤذن ) . ویستی بانگ بدا بۆ نوێژی نیوەڕۆ . پێغەمبەر فەرمووی بانگەکە دوا بخە نەختێك بافێنك دابێ پاشان دیسان ویستی بانگ بدا .فەرمووی دوا بخە بافێنك دابێ . دوای خست هەتا چاومان بەسێبەری تەپۆلکان کەوت چونکی ، زۆر گەرمی

دونیا لەهەتاسەی جەهەنەمە ئنجا وەکوو گەرما تینی سەفلو سەختبوو نوێژ دوابخەن . هەتافێك دادێ .

---

**١٧٩ عن أنس . قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ان فيها ( اي في الساعة ) . امورا عظاما . من احب ان يسئل عن شيء فليسئل فلا تسئلوني عن شيء الا اخبرتكم به ما دمت في مقامي هذا .**

**سلوني . ابوك حذافة . سلوني عرضت علي الجنة والنار . آنفا في عرض هذا الحائط فلم أر كالخير والشر .**

( تەرجەمە )

١٧٩ دەگێرنەوە لەئەنەس رەزای خودای لێ بی بەڕاستی پێغەمبەر (د) . لەکاتی زەوالی ڕۆژ لە خەتی ئیستوا هاتە دەرێ . نوێژی نیوەڕۆی کردە چووە سەر مینبەر . باسی قیامەتی کرد . زۆر اموری گەورە گەورەی لەئەحوالی قیامەت گێڕاوە . پاشان فەرمووی هەرکەسێك حەزدەکا لەهەرشتێك سؤال بکا بابپرسی . لەهەر شتێك لێم بپرسی جوابتان دەدەمەوە . هەتا لەم جێگایەی خۆم بمعالەم درێژەی دایێ لەگریان ئەویش لەسەر یەکتری دەی فەرموو . سؤالم لێ بکەن . عبداللەی کوڕی حوذافەی سەهمی . هەلستا گوتی . باوکی من کێیە چونکی بەناوی غەیری باوکی خۆی ناسرابوو فەرمووی باوکی تۆ حوذافەیە . پاشان هەر لەسەر یەکتری فەرمووی بپرسن بپرسن . حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی چۆکی دایەوە لەسەر دوو ئەژنۆی گوتی بەدڵ ئێمە ڕازین بەخودایەتی یەزدان وەبە دینی خۆمان

کـەئیســـلامە • وە ڕازیشـــین بەپێغەمبـــەرایەتی • پێغەمبـــەری خۆشمان کە محمدە (د) • ئنجا نەختێ پێغەمبەر (د) ســکوتی کردو کڕبوو • پاشان فەرمووی نیشانم درا ئێست ــ بەهەشتو ئاگر • لەلای ئەم دیوارە قەت نەمدیوە وەکوو ئەم خۆشیو نیعمەتەو جوانیەی کە لە بەهەشــتدا هەیە • وەکوو ئەو عەزابو ئەزیەتو مشقەتەی کە لە جەهەنەمدا هەیە • ( هەنــدێ لەم حەدیثە لەباس زانیی لەریوایەتی ئەبوموسی ڕەت بوو بەلام لەم ڕیوایەتە هەندێ زیادەو گۆڕانهەیە • لەئەلفاظ ) •

---

**١٨٠ عن ابن عمر رضي الله عنهما • ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال : الذي تفوته صلوة العصـر كأنما وتر اهله وماله •**

**( تەرجـــەمە )**

١٨٠ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەرــ ڕەزای خودایانلێبی• کەپێغەمبەری خودا (د) • فەرمووی : ئەوکەسەی نوێژی عەسری بەبێ عوزر دەچی • وەکوو ئەوکەسەیە کەکەسو کارو مالی هەموو لێستاندرابی وایە •

---

**١٨١ عن بريدة (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم من ترك صلاة العصر فقد حبط عمله •**

**( تەرجـــمە )**

١٨١ دەگێـــڕنەوە لەبورەیـــدە ــ ڕەزای خودای لێبی • ڕۆژێك

هەوور بوو گوتی بەئازایی نوێژی عەسر بکەن چونکی بەتەحقیق پێغەمبەر(د) فەرمووی هەرکەسێك تەرك بکا نوێژی اعەسر هیچ پاداشـــتێکی نامێنێ • ئەم حەدیثە لەسەر سەبیلی تەغلیظ واردبووە ئەگەرنا ئەواب بەغەیری شـرك نەفەوتێ وەکوو قورئانی مەجید دەفەرمووی • ومن یکفر بالایمان فقـد حبط عمله • یاخۆ تەرکی نوێژ بە مباح بزانێ وکافربیی والله اعلم •

---

## ١٨٢ عن جرير (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم انكم سترون ربكم • كما ترون هذا القمر • لاتضامون في رؤيته • فان استطعتم • ان لاتغلبوا • على صلاة قبل طلوع الشمس • وقبل غروبها • فافعلوا • ثم قرء • وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها •

( تەرجـــمەمە )

١٨٢ دەگێرنەوە لەجەریر ــ ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەخدمەت پێغەمبەر بووین (د) لەشەوی چواردەی مانگ • تەماشای مانگی کرد فەرمووی بەبێ گومان • ئێوە لەقیامەت خودای خۆتان دەبینن • وەکوو دیتنتـــان بۆ ئەم مانگە • بەبێ زولم و مانلوو بوون لەئەصلی دیتن هەمووتان وەکوویەکن • نەك بەم تەرزە هەندێکتان بی بینن هەندێکتان نەی بینن • ئنجا ئەگەر پێتـــان دەکرێ کەمەغلوب نەبن لە • بەجێ گەیاندنی نوێژێك لەپێش ڕۆژهـــەلات وە نوێژێکیش لەپێش ڕۆژ ئاوابوون بیکەن • پاشان ئەم ئایەتەی خوێنـــدەوە (وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب) •

لەم حەدیثە وافەهم دەکرێ کەنوێژی سبەینەو عەسر لەوانی تر گەورەترن.

---

**١٨٣ عن ابي هريرة (ض) ان رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . قال يتعـاقبون فيكم ملائكـة بالليل وملائكة بالنهار ويجتمعون في صلاة الفجر . وصلاة العصر . ثم يعرج الذين باتوا فيكم فيسئلهم . وهو اعلم بهم . كيف تركتم عبادي فيقولون تركناهم وهم يصلون . واتينـاهم وهم يصلون .**

**( تەرجـەمە )**

١٨٣ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بێ . بـە تەحقیق پێغەمبەر (د) . فەرمووی چەند مەلائکە بەشەو چەند مەلائکە بەڕۆژ. لەدوای یەکتری دێنە لاتان لە نوێژی بەیانی وە لە نوێژی عەسر . هـەردوولا کۆدەبنەوە (لای هەرکەسێك) . پاشان ئەوانەی کەبەشەو لاتـان بوونـە هەوراز دەچن . ئنجا خودای گەورە بە تەعبد لێیاندەپرسی نـەك بۆزانین چونکی خودا زاناترە بەئەحوالی خەلکی لەوان . دەفەرموێ عیبـادی منتان لەسەر چە ئەحوالێك بەجێهێشت . جواب دەدەنەوە کەجێمان هێشتن ئەوان نوێژیان دەکرد . وەچووینە لایان ئەوان نوێژیان دەکرد .

---

**١٨٤ عن ابي هريرة (ض) . اذا ادرك احدكم سجدة من صلاة العصر قبل ان تغرب الشمس فليتم صلاته . واذا ادرك سجدة من صلاة الصبح قبل ان تطلع الشمس . فليتم صلاته .**

( تەرجـەمە )

١٨٤ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بێ گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) ، وەکوو یەکێك لەئێوە بەیەك سەجدە ڕابگا ( یەعنی بەیەك ركعەت ) ، لەنوێژی عەسر لەپێش ئاوابوونی خۆر بانوێژەکـەی خۆی تەواو بکا، وەکوو گەیشتە یەك سەجدەش لەنوێژی بەیانی لەپێش دەرچوونی خۆر بانوێژەکەی خۆی تەواوبکا ، ( یەعنی بە دەرچوونی بەشێکی نوێژەکان لەکاتی کردنی نوێژەکان بەسەرناچن ، ( حوکم وایـە لای جمهوریعولەما ، بەلام لای ئیمامی ئەعزەم ئەبوو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی: نوێژی عەسر ئەگەرچی بەم نەوعە ڕاستە بەلام نوێژی بەیانی بـە دەرچوونی خۆر لەکاتی نوێژ کردن ، دروستنییە ، دەبێ پاشان قەزای بکاتەوە چونکی لەکـاتی تـەواو کـە دەسـتی پێکرد جـائز نـەبوونی تەواوکـردنی لەکاتی ناتەواو لەقواعدی اصولە ، بەلام نوێژی عەسـر لەکاتی ناتەواویش تەواو بکا دروستە ، یەعنی ئەوەلی هەرشتێك ئەگەر لەکاتی تـەواوبێ ئەبێ آخریش لەکاتی تەواوبێ ئەگەر ئاخری بکەوێتە کاتی ناتەواو دروست نییە ، خولاصە ئەبێ هەردووسەری لەکەمالدابێ یاخۆ هەردووسـەری لەناتەواوی دابێ ، ئەگەرنا نادروستە ،

---

**١٨٥ عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما انه سمع رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول انما بقاؤكم فيما سلف قبلكم من الامم كما بين صـلاة العصـر الى غـروب الشمس ، أوتي أهـل التـوراة التـوراة فعملوا حتى اذا**

انتصف النهار عجزوا فأعطوا قيراطا قيراطا ثم أوتي أهل الانجيل الانجيل فعملوا الى صلوة العصر . ثم عجزوا فأعطوا قيراطا قيراطا . ثم اوتينا القرآن . فعملنا الى غروب الشمس فأعطينا قيراطين . فقال اهل الكتابين . اي ربنا اعطيت هؤلاء قيراطين قيراطين واعطيتنا قيراطا قيراطا . ونحن كنا اكثر عملا . قال الله تعالى . هل ظلمتكم من اجركم من شيء قالوا لا قال فهو فضلي اوتيه من اشاء .

( تەرجـەمە )

۱۸۵ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ــ ڕەزای خودای لێ بێ . بەحەقیقەت بیستی لەپێغەمبەری خودا (د) . دەی فەرموو: بەتەحقیق مانەوەی ئێوە لە دونیا بەنسبەت ئومەتەکانی پێشوو . وەکوو مابەینی نوێژی عەسر هەتا ڕۆژ ئاوا بوون . تەورات درایە ئەهلی تەورات . کاریان پێ کرد هەتا نیوەڕۆ . عاجزبوون لەکار پێ کردنی ڕۆژی تەواو . هەریەکێك لەوان حەقی نیو ڕۆژی وەرگرت . نیودانگ . نیودانگ . پاشان ئنجیل درایە ئەهلی ئنجیل . ئەوانیش کاریان پێ کرد هەتا نوێژی عەسر . پاشان عاجز بوون لەئیشی تەواوی ڕۆژ . بەوانیش درا نیودانگ نیودانگ . حەقی دانە ڕۆژێك .

پاشان بەئێمەدرا قورئان . کارمان پێ کرد هەتاڕۆژ ئاوابوون . ئنجا بەئێمەدرا دوو دانگ فرانگ . حەقی تەواوی ڕۆژ ئنجا ئەهلی تەورات و ئنجیل گوتیان . ئەی بەخێوکەری ئێمە دات بەئومەتی محمد دوو دانگ . حەقی تەواوی ڕۆژ . کەچارێکەکی ڕۆژیش ــ ئیشـیان کردووە . دانگ دانگت بەئێمەدا کەئێمەش زیاتر ئیشمان کردیە خودا دەفەرموی . هیچ حەقم لەئێوە

بڕیوه دەڵێن نا : استحقاقی ئیشی خۆمان وەرگرتووه دەفەرموێ • حـــەقی تەواوی ڕۆژم کەداوەتە ئەهلی قورئان لەچاکـــەی خۆمـــە هەرکەسی خۆم حەزبکەم چاکەی خۆمی لەگەل دەکەم • ( به استلزام فەهم دەکرێ مـــدەی دونیا زۆر نەماوه ) •

---

**١٨٦ عن عبـــدالله المـــزني (ض) ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • لا تغلبنكم الاعراب على اســـم صلاتكم المغرب ويقول الاعراب هي العشاء •**

**( تەرجـــەمه )**

١٨٦ دەگێڕنەوه لەعبدالله موزنی ڕەزای خودای لێبی بێ گومـــان فەرمووی پێغەمبەر (د) بێ گومان پێغەمبەر فەرمووی (د) • تابعی عەرەبەکانی سەحرانشین مەبن لەناوبردنی نوێژی مەغربتان بەعشا خودا نـــاوی بـــردووه بەمەغرب • ئەمه باشتره لەناوبردنی بەدەویان کە پێی دەڵێن عیشا •

( عەرەبەکانی سەحرانشین بەنوێژی مەغربی ئیسلامیان دەگوت عیشا) •

---

**١٨٧ عن عائشة رضي الله تعـــالى عنها • قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • ما ينتظرها احد من اهل الارض غيركم •**

**( تەرجـــەمه )**

١٨٧ دەگێڕنەوه لەدایکی ئیماندارا‌ن حەزرەتی عائشه ڕەزای خودای

لێ بێ • گوتی پێغەمبەر (د) شەوێك نوێژی عیشای دواخست • هێشتا دینی ئیسلام لەدەرەوەی مەدینە بلاو نەبووبۆوە • ئنجا تەشریفی لەماڵی دەرنەچوو هەتا حەزرەتی عومەر عەرزی کرد • منـــاڵو ئافـرەت لەچـاوەڕێی نوێژ لەمزگەوت خەویان لێ کەوت• ئنجا تەشریفی هاتە دەرێ • بە ئەهلی مزگەوتی گوت • هیچ یەکێك لەئەهلی عارد چاوەڕێی نوێژ ناکا ئێوە نەبێ •

---

**١٨٨ عن ابي موسى (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • على رسلكم ابشروا ان من نعمة الله عليكم انــه ليس احد من الناس يصلي هــذه الساعة غيركم او ما صلى هذه الساعة احد غيركم •**

( تەرجــەمە )

١٨٨ دەگێرنەوە لەئەبوو موسی ـ ڕەزای خودای لێ بێ • پێغەمبەر (د) شەوێك لەسازدانی لەشکرێك بوو نوێژی عیشای دواخست هەتـا نیوەی شەو • پاشان تەشریفی هاتە دەرێ نوێژی بە ئەصحاب کرد وەکوو لەنوێـژ بۆوە • فەرمووی لەسەرەخۆبن عەجەلەمەکەن • بێ گومان نی یە یەکێك لـە خەلکی نوێژبکا ئەم سەعاتە • ئێوە نەبن • یاخۆ فەرمووی نوێژی نەکردووە لەم سەعاتە یەکێك غەیری ئێوە • ئەبوو موسی فەرمووی هەموومـان بـەم قسەیە زۆر کەیف خۆش بووبن • کەپێغەمبەری خودا لەسەر ڕوویی عـارد ئێمەی خاص کرد بەم عیبادەتە •

---

**١٨٩ عن ابن عباس (ض) قال النبي صلى الله تعالى**

**عليه وسلم . لولا ان أشق على أمتي لامـــرتهم ان يصلوهـــا هكذا .**

( تەرجـــەمە )

١٨٠ دەگێــــڕنەوە لە ابنی عبـــاس ــ ڕەزای خودای لێ بی ــ پێغەمبەر (د) فەرمووی . ئەگەر لەبـەر ئەمەنەبوایە کـە موشـــــەقەتێك بخەمە سەر ئومەتی خۆم ئەمرم پێدەکردن کەنوێژی عیشا لەم کاتە بکـــەن کەسێ یەکی شەوە .

---

**١٩٠ عن ابي موسى (ض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم من صلى البردين . دخل الجنة .**

( تەرجـــەمە )

١٩٠ دەگێــــڕنەوە لەئـەبوو موسی ــ ڕەزای خودای لێ بی ــ پێغەمبەر(د) .فەرمووی هەرکەسێك نوێژی بەیانو نوێژی عەسربکا کەوەقتیان ساردو فێنکە . داخلی بەهەشت دەبی .

---

**١٩١ عن ابن عمر رضي الله عنهما قال النبي صلى الله تعالى عليه وســـلم . لا تحروا بصلاتكم طلوع الشمس ولا غروبها .**

( تەرجـــەمە )

١٩١ دەگێڕنەوە لە ابنی عمر پێغەمبەر (د). فەرمووی قەصدمەکەن

بەنوێژی خۆتان هەلاتنی ڕۆژو ئاوابوونی ڕۆژ • کەنوێژی بەیانیو عەسـرە •
بەلام ئەگەر کەسێك لەخەودا مابێ • یاخۆ لە بیری چووبێ بالەکاتی هەلاتنی
ڕۆژو ئاوابوونی ڕۆژیش بێ بابیکا چونکی ئەمانە قەصدیان تیانی یە (لەمێژنی یە
ڕابرد حەدیثی ( من ادرك سجدة ) ای رکعة : ئەمە ئەدایە قەضانیە لە رەقـەم
(١٨٨) ڕەت بوو •

---

**١٩٢ عن ابن عمر رضي الله تعالى عنهما قال : قـال رسول الله صلى الله تعالى عليـه وسـلم • اذا طلع حاجب الشمس فاخروا الصلوة • حتى ترتفع واذا غـاب حـاجب الشمس فاخروا الصلاة حتى تغيب •**

**( تەرجـەمە )**

١٩٢ دەگێـڕنەوە لـە ابنی عمـر ــ ڕەزای خودای لێ بی گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) • وەکوو بڕۆی خۆر: یەعنی وەکوو کەوانەیەك لەلای سەرەوەی خۆر دەرچوو • نوێژی بەبێ سەبەب مەکەن هەتا بلنددەبی وەکوو بزریش بوو لای خوارەوەی خۆر نوێژی بەبێ سەبەب مەکەن • هەتا بـە تەواوی ئاوا دەبی • گوتوویانە بەرزی خۆر لازمە مقداریك ڕم بێ • ئـەهلی تەقویم تەقدیریان کردووە بەرز بوونەوەی خۆر مقداری یەك ڕم بە بیست و پێنج دەقیقە •

---

**١٩٣ عن ابي قتادة (ض) • قال رسـول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اخاف ان تناموا عن الصلوة يا بـلال**

این ما قلت . ان الله قبض ارواحکم حین شاء . وردها علیکم حین شاء یا بلال قم فاذن بالناس بالصلوة .

( تەرجـــەمە )

١٩٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو قەتادە ــ ڕەزای خودای ــ لێ بی . گوتی وەکوو پێغەمبەر لەغەزای خەیبەر گەڕایەوە ئێمە لەخدمـەتی‌دا شـــەوێك ڕۆیشتین . هەندێ لەئەصحاب عەرزیان کرد . کاشکی نەختێ بۆ حەسانەوە دابەزیبواین یا رسول الله . فەرمووی ئەترسێم لەخەودا بمینین نوێژتان بچی . بلال گوتی من بەخەبەرتان دەینم ئنجا پالیانداوە . بیلالیش پالیدا بەوو شتری سواری خۆی . ئنجا خەو غەلەبەی لێ کرد خەوی لێ کەوت ئنجا پێغەمبەر(د) . وەکوو بەخەبەرهات لای سەرەوەی خۆر دەرچووبوو . فەرمووی ئەی بلال قسەکەت لەکوێ‌ما . گوتی نەخراوەتە سەرمن خەوێکی وا لەجیـــاتی خۆم . فەرمووی . وەکوو خودا حەزی کرد . رووحی ئێوەی وەرگـــرت . یـــەعنی تەعەلوقو تصروفەکەی بڕی لە لەشی ئێوە . ظاهرا نەك باطنا وەکوو حەزیشی کرد . گێڕایەوە سەرئێوە ئەی بلال هەلستە بۆخەلکی بانگی نوێژی ســـبەینە بدە . ئنجا هەلستاو دەســـت نوێژی شـــووشت . وەکوو خۆر بەرزبوو سپی وساف داگەڕا . هەلستا نوێژی کرد .

---

١٩٤ عن جابـــر (ض) . قال رســـول الله صلی الله تعالی علیه وسلم . والله ما صلیتها .

( تەرجـــەمە )

١٩٤ دەگێڕنەوە لەجابر ــ ڕەزای خودای لێ بی ــ گوتی حەزرەتی

عومەرــرەزای خودای لێ بێـلەغەزای خەندەق لەپاش ڕۆژئاوابوون هات • گوتی لەپاش جنێوەکانی بەکافرەکانی قورەیشی • یا رسول الله نوێژی عەسرم نەکردووە هەتا ڕۆژ ئاوابوو • پێغەمبەر (د) فــەرمووی والله منیش نوێــژی عەسرم نەکردووە • ( یەعنی لەپاش ئەمە لەڕقان جنێوی بەقورەیشدا چونکی موحارەبەی ئەوان بووە سەبەبی تەئخیری نوێژەکە گوتی نوێژی عەســـرم نەکردووە ) • ئنجا چووینە ــ بەطحان ــ مەدینە دەســتنوێژی شــووشت • ئێمەش دەستنوێژمان شووشت لەپاش ڕۆژ ئاوابوون نوێژی عەســـری کرد نوێژی مەغریبشی کرد • لەم حەدیثە پیرۆزە ئیمامی ئەعزەم ( ئەبوو حەنیفە) • استنباطی کردووە • تەئخیری نوێژ لەبەر شەڕکردن لەگەل دوژمن پاشانیش قەضا بکرێتەوە گوناهی نی‌یە • لای ئیمامی شافعیش بەهیچ وەجهێك عەمــدا وقصدا نابی نوێژ بچی • لەکاتی شەڕیش دەبێ شەریش بکا نوێژیش بکــا بابەئیشارەتیش بێ • دەبی بیکا • بەلام ڕوو لەقیبلەکردن شــــەرت نی‌یە • فەوتانی نوێژی پێغەمبەریش • یاخۆ لەبەر زۆر مەشغوول بوونی بەشەڕ لەگەل کافران بووە • کەلەیادی چووە • یاخۆ مەشروعیەتی نوێژی ترس لەپاش ئەم ڕووداوە بووە • بەلام ئیمامی حەنەفی فەرموویتی • ( صلاتی خوف ) نوێژی ترس تایبەتە بەترسێك لەکاتی شەڕ نەبێ • بۆیە پێغەمبەر نوێژی چووە یەعنی مەشروعیەتی صەلاتی خەوف کەهەر دەبێ بکرێ • ئەگەر نوێژکەر لەکــاتی شەڕ نەبێ • بەلام ئەگەر لەکاتی شەڕبی ئەگەر نوێژیشی بچی هیچ گوناە نی‌یە پاشان قەضای بکاتەوە •

---

**١٩٥ عن أنس (ض) • قال النبي صلى الله تعــالى عليه وسلم من نسي صلاة فليصل اذا ذكرها كفارة لها الا ذلك • واقم الصلوة لذكري •**

( تەرجـەمە )

١٩٥ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بێ پێغـــەمبەر (د) • فەرمووێتی • هەرکەسێك نوێژی لەبیرچوو • بانوێژەکەی خۆی بکا بەواجبی وەکوو کەوتەوە یادی • هیچ شتێك گوناهی نوێژ چوونەکـەی داناپۆشی • هەروەکوو خودا دەلێ نوێژبکە بۆیادی من •

---

**١٩٦ عن أنس (ض) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم لم تزالوا في صلاة ما انتظرتم ثم الصلوة •**

( تەرجـەمە )

١٩٦ دەگێڕنەوە لەئەنەس ــڕەزای خودای لێ بێــ گوتی پێغەمبەر (د) • فەرمووی ئێوە مادام لەچاوەڕێی نوێژدابن لە ثـەواب ( پاداشتی ) • نوێژدانە •

---

**١٩٧ عن عبدالرحمن ابن ابي بكر رضي الله عنهما • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم من كان عنــــده طعام اثنين فليذهب بثالث • وان اربع فخامس او سادس •**

( تەرجـەمە )

١٩٧ دەگێڕنەوە لەعبدالرحمن کوڕی ابو بکری صـــــدیق ڕەزای خودایان لێ بێ • گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) • هەرکەســـێك خواردنی

دووکەسی لاهەیە • با یەکێك لە هەژارەکانی ئەهلی (صوفە) • لەگەل خۆی بیا ببن بەسێ • وە ئەگەر خواردنی چوارکەسی لاهەیە • با پێنجەمینێك • یاخۆ شەشەمینێك لە ئەهلی (صوفە) ببا • یەعنی یەکێکی تر یاخۆ دووکەسی تر • ئەبوو بەکریش سێ کەسی بردە ماڵێ • پێغەمبەریش (د) دەکەسی بردەماڵێ •

## بـاب بدء الاذان

## باسی دەست پێ کردنی بانگ

---

بسـم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەی بەرەحم

**١٩٨ عن ابن عمر رضي الله تعالى عنهما قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . يا بلال قم فناد الصلاة .**

( تەرجـمەمە )

١٩٨ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومـەر ڕەزای خودای لێ بی . پێغەمبەر(د) . فەرمووی ئەی بیلال هەستە گاز بکەو دەعوەت بکە بۆ نوێـژ یەعنی بەم شێوەی کەدیارەو دانراوە بانگ بدە .

---

**١٩٩ عن ابي هريرة (ض) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم . قال اذا نودي للصلاة ادبر الشيطان وله ضراط حتى لا يسمع التأذين . فاذا قضي النداء أقبل حتى اذا ثوّب بالصلوة . ادبـر حتى اذا قضي التثويب . أقبـل حتى يخطر بين المرء ونفسه يقول اذكر كذا اذكر كذا لِما لم**

## يكن يذكر حتى يظل الرجل لا يدري كم صلى •

( تەرجــەمە )

١٩٩ دەگێڕنەوە لە ئــەبوو هورەیــرە ــ ڕەزای خودای لێ بێ • بەڕاستی پێغەمبەر (د) • فەرمووی وەکوو بۆنوێژ بانگ درا شەیتانی مەلعون پشت دەداو ڕادەکا • بەتڕکردن • هەتا گوێی لەبانگدان نەبێ • پاشــــان وەکوو بانگ تەواو بوو • هجوم دەکاتەوە سەرخەلکی هەتا قامــەت بۆ نوێژ دەکرێ • دووبارە پشت دەداو ڕادەکا هەتاقامەت تەواو دەکــرێ دووبــارە هجوم دەکاتەوە سەرخەلکی بۆ خاتری خەیالاتی قۆڕو بێ کەلك• بخاتە ناو دلی نوێژکەران • دەلێ یادبکە فلان شتە وەفلان ڕووداو یادبکەوە • لەشتی وا کە ئەگەر لەنوێژ نەبێ بیری بۆناچی • بۆ ئەوەی پیاو وای بەسەربێ نەزانێ چەند ڕکعەت نوێژی کردووە •

